# ڕیشەی کاریگەرییەکانی بریتانیا لە میسۆپۆتامیادا



زەکی ساڵح

وەرگێڕ: کامیل محەممەد قەرەداغی

# ریشەی کاریگەرییەکانی بریتانیا
# لە میسۆپۆتامیادا

زەکی سالّح

وەرگیّڕانی لە ئینگلیزییەوە
کامیل محەمەد قەرەداغی

مەلّبەندی کوردۆلۆجی

**هەرێمی کوردستان**
**سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران**
**مەڵبەندی کوردۆلۆجی**

- ناوی کتێب: ڕیشەی کاریگەرییەکانی بریتانیا لە میسۆپۆتامیادا
- نووسەر: زەکی سالح
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کامل محەمەد قەرەداغی
- پیتچنین: وەرگێڕ
- دیزاین و سەرپەرشتیی چاپ: بریار فەرەج کاکی
- بەرگ: ڕەنج شوکری
- ژمارەی سپاردن: ١٣٣٤/ ساڵی٢٠٠٩
- چاپخانە: ڕەنج/ سلێمانی
- تیراژ:١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- زنجیرە: ٣١

مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/ ١٠٥، کۆڵان/ ٢٥، ژ.خانوو/ ٤، ژ. پۆست/ ٩٥
تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣
kurdology2006@yahoo.com

# ناوەرۆک

| بابەت | لا |
|---|---|

# سەرەتا

بەگشتی ئەوە شتێکی زانراوە، کە ناوچەی میسۆپۆتامیا، ئەوەندەی سیحری هەبووە بۆسەر خوێندکارانی مێژووی دێرین و تەنانەت مێژووی چاخەکانی ناوینیش، ئەوەندە لەلایەن خوێندکارانی مێژووی مۆدێرنەوە گرنگیی پێنەدراوە. بنکەی یەکێك لە ناودارترین ئیمپراتۆریاکانی سەردەمی دێرین لەسەر کەنارەکانی دوو رووبار بووە و لە بەغداوە خەلیفە (ئەلمەئمون٨١٣-٨٣٣) فەرمانڕەوایی بەسەر ناوچەیەکدا کردووە، کە بە درێژایی هەموو سەردەمەکان بەرفراوانترین و گەشەسەندوترین ناوچەی جیهانی کۆن بووە لە تەنها رووداوێکی رەوتەنییەوە نەبووە، بەڵکو بەپیتیی خاکەکەی و سەرچاوە و داهاتی دوو رووبارە شکۆدارەکەی و شوێنەکەی، کە ناوجەرگەی زەوییەکانی رۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست و ئەوانەی دەریالوشی هیندی بووە، هەموو ئەمانە فاکتەری بنچینەیی بوون لە دروستکردنی مێژووە گەش و ناودارەکەیدا.

ئەوەی مایەی گاڵتەجاڕیی قەدەر بوو، ئەوەبوو سەرباری ئەم دەستکەوتانە ئەو بەدبەختییەیان بەدواداهات، کە وڵاتەکە هەرەسی هێنا. هەورازی سەختی هاتەسەر رێ و کۆسپی کەمیی کەرەستەی خۆراکی رێگەی پێگرت. سوپا بەربەرییەکانی ناوەڕاستی ئاسیا داباریین بەسەر دۆڵی نێوان دوو رووباردا، بەغدایان داگیرکرد. لەساڵی (١٢٥٨) دا بە یەکجار ئیمپراتۆریا گەورەکەی عەباسی و وەچەکەیشیان بە ئاکامێکی ترسناك گەیاند. بەدوای ئەوەشدا سێ سەدەی شپرزەیی (تەمەنی تاریکیی میسۆپۆتامیا) هات. ئەمە سەردەمی پێش فەرمانڕەوایی تورکە عوسمانییەکان بوو بەسەر وڵاتەکەدا، کە ئەمانیش ماوەی نزیکەی زیاتر لە چوار سەدە و تا ساڵانی (١٩١٤-١٩١٨) وڵاتەکەیان بەڕێوەبرد. لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکانیشدا میسۆپۆتامیا نە گەشەیەکی کولتووریی بەخۆیەوە دی و نە حکومەتێکی باشیشی هەبوو.

لەو دەمەدا بەهۆی ستراتیجیبوونی شوێنەکەیەوە، میسۆپۆتامیا بابەتێکی زۆر گرنگ بووە و سەرنجی بریتانیای بەلای خۆیدا راکێشاوە. هـــەر لە سەرەتاکانی ساڵانی (١٥٨٠)ەکانەوە شاژنە ئەلیزابیس بەڵێنی دابینکردنی ئاسایش و مامەڵەی باشی بۆ

بازرگانه بریتانییه‌کان له‌ناو خاکی عوسمانییه‌کاندا له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵاتی عوسمانیی باڵاوه وه‌رگرتبوو. بازرگانه بریتانییه‌کان که‌وتنه ئه‌وه‌ی به ره‌وته‌نی و به‌شێوه‌ی کاتی له‌سه‌ر ڕێگای هاتن وچوونیان بۆ ئیندیز به میسۆپۆتامیادا تێپه‌ڕن. ئینجا ماوه‌یه‌کی که‌م پاش ئه‌وه هێزه ده‌ریاییه‌کانی بریتانیا، پورتوگالی و پاشانیش هۆڵه‌ندییه‌کانیان له که‌نداوی فارس ڕاماڵی، که ئه‌ویش ده‌روازه‌یه‌کی سروشتی بوو بۆ میسۆپۆتامیا و بوو به به‌ردی بناغه‌یش بۆ کاریگه‌ریی بریتانیا له‌سه‌ر ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست به‌گشتی.

کاتێکیش، که فه‌ره‌نسا به‌دووای هۆڵه‌نده‌دا له ده‌ریالووشی هیندیدا بوو به رکه‌به‌رێکی بازرگانیی گه‌وره‌ی بریتانیا، به مسۆگه‌ری زاری که‌نداوی فارسیش بوو به خاڵێکی چه‌قبه‌ستنی ململانه‌ی نێوانی دوو ده‌سه‌ڵاته‌که. ئه‌م پێشقه‌چوونانه تا ساڵی (١٧٩٨) له به‌شی یه‌ك و دووی ئه‌م کاره‌ی ئێسته‌دا باسیان لێوه‌کراوه.

هه‌رچه‌نده بریتانیا پێش ساڵی (١٧٨٩) هیچ گرنگییه‌کی گه‌وره‌ی به ئیمپراتۆریای عوسمانی نه‌داوه، به‌ڵام له‌و ساڵه زۆر گرنگه‌دا (ناپلیۆن بۆناپارت) میسری داگیرکردووه و سه‌ره‌تای ئه‌و شته‌ی داناوه، که ده‌توانین ناوی لێبنێین (سه‌رده‌می ناپلیۆنی له ڕۆژهه‌ڵاتدا). کاریگه‌ریی ئه‌م شته له‌سه‌ر په‌یوه‌ندییه‌کانی بریتانیا له‌گه‌ڵ وڵاتاندا ئه‌وه بوو کشانه‌که‌ی له ئیسته‌نبوڵه‌وه تا که‌لکوتا زۆر به‌باشی گه‌شه‌ی کرد و گه‌وره بوو.

له ڕاستیدا هه‌ر له ده‌ماوده‌می ساڵه یه‌کلاییکه‌ره‌وه‌کانی (١٧٩٨ تا١٨٠٩) دا بوو، که کاریگه‌ریی بریتانیا به یه‌کجاری که‌وته سه‌ر تورکیا، ئێران و له‌سه‌رووی هه‌مووشیانه‌وه که‌وته‌سه‌ر نیمچه‌دورگه گه‌وره‌که‌ی هیند. به‌بێ ئه‌م ڕووداوانه بریتانیا بۆی نه‌ده‌لوا ده‌سه‌ڵاتی خۆی له‌ناو میسۆپۆتامیا و به‌سه‌ریشیدا بسه‌پێنێت، بۆیه به‌شی دوو و سێ ته‌رخان کراون بۆ ئه‌م باسه.

له دوو ده‌یه‌ی یه‌ك به‌دوای یه‌کی (١٨١٠ – ١٨٢٠) دا کاریگه‌ریی بریتانی له ناوچه‌ی ئێران و که‌نداوی فارسدا به‌رفراوانتر بوو. هه‌روه‌ها ڕژێمه مه‌ملوکییه‌که‌ی ناو میسۆپۆتامیاش له‌ساڵی (١٨٣٠) دا وازی له ده‌سه‌ڵات هێنا و دای به ده‌ستی ده‌سه‌ڵاته گریمانه‌ییه‌که‌ی سوڵتانی عوسمانییه‌وه. ئه‌م ڕووداوانه‌ش، که وایان کرد ڕاسانی کاریگه‌ریی بریتانا له میسۆپۆتامیادا زۆر ئاسان و زۆر سروشتی بێت، له به‌شی چواره‌مدا باسکراون.

له ده‌می ساڵانی (١٨٣٠–١٨٦٠) کاریگه‌ریی بریتانیا بۆ دواجار له‌سه‌ر که‌ناره‌کانی ڕوباری دیجله و فورات، له ڕێگه‌ی زنجیره‌یه‌ك چالاکیی به‌رچاوی بریتانییه‌کانه‌وه

دامەزرا. پاڵنەری سەرەتایی ئەم دامەزرانە بوونی ترسی ئەو گریمانە بوو روسیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر میسۆپۆتامیا و کەنداوی فارسدا بسەپێنێت. ئەم ترسانە تاچەند بەجێ و راستەقینە بوون و ئەو چالاکییانە تاچەند بەرچاو بوون، ئەمە لە بەشی پێنجەمدا باسی لێکراوە.

هۆی ئەوەی، کە ژمارەیەکی باشی لاپەڕەکانی پاشتر تەرخان کراون بۆ باسی کاروباری تورکیا و هیندستان، ئەو راستییەیە، کە میسۆپۆتامیا سەر بە عوسمانییەکان بووە، هەروەها پەیوەندییە ئەنگلۆ-هیندییەکانیش بە توندی گرێدرابوون بە مەسەلەی گەشەی کاریگەریی بریتانیا لە میسۆپۆتامیادا.

هۆی ئەوەش، کە بەشێکیش تەرخان کراوە بۆ ئێران و کەنداوی فارسی، ئەوەیە کە پێویستە تێبینیی ئەوە بکرێ ئەم ناوچانە لە واقعدا پێکەوە، لەگەڵ دۆڵی دیجلە و فوراتدا یەک کایەی کاریگەریی بریتانییان پێکدەهێنا، وا چاویان لێدەکرێ، لەمانەوە خزانی بەرەو جەنگی جیهانی دەستی پێکردبێ. وەک سەرەتایەک دەبێ باس لەوە بکەین، کە تێرمی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە بەشەکانی داهاتووی ئەم گێڕانەوەیەدا بۆ ئاماژەدان بەو ناوچانە بەگشتی بەکارهێنراوە.

پاشان دەبینرێ، کە چوار بەش لەم پێنج بەشەی ئەم وتارە باس لەو شتە دەکات، کە دەتوانین راست و دروست پێی بڵێین روانینەکانی بریتانیا بۆ میسۆپۆتامیا و پێنجەم بەشیشیان باس لە جێگیربوونیان لەو ناوچەیەدا دەکات.

ئەوە روونە، کە لە سەردەمانی رابوردوودا بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی بریتانیا پچڕپچڕ و نیمچە لەرزۆک بوو، بەڵام پاشتر بەو بەها ستراتیجییانەی لەبەرچاوگیران لە رکەبەریکردنی هەر یەکەی پورتوگال، کۆماری هۆڵەندە و فەرەنسا یەک لەدوای یەک و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر، وایان کرد بۆ بریتانیا پێویست بێت چالاکانە دەست وەربداتە ناو کاروبارەکانی عەرەبستانی باشوور و کەنداوی فارس و خودی وڵاتی ئێرانیش. لە راستییشدا ئەم بەرژەوەندییە نوێیەی بریتانیا بەڕوونی شتێکی ناوەندی بوو لەچاو پرۆژەکەی خۆی لەناو هیندستاندا. ئەم گۆڕانە لە شتێکی هەڕەمەکییانەی لەخۆوە، بۆ پێوەسەرقاڵبوونێکی چالاکانە لە رێگەی بەلەمی هەڵمی و ئەو هێڵە ئاسنینیانەوە بوو، کە بە هەڵم کاریان دەکرد.

لەبەر دوو بەها، کارکردنی سەر ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتی بە پرۆژەی (ئەودیوو دەریاکان) ی بریتانی بەستووە، نەک مێژووی ناوخۆیی میسۆپۆتامیا: یەکەمیان ئەوەیە

دەستپێشخەریکردن بۆ کاریگەرییەکە لەلایەن بریتانیاوە بووە و بەدەستی خەڵکی میسۆپۆتامیا نەبووە. دووەمیان ئەوەیە خەڵکی دۆڵی دوو رووبارە گەورەکە هیچ تۆمارێکی ئەوتۆیان لەبارەی بەریەککەوتنی خۆیان لەگەڵ بریتانیا لێ جێ نەماوە. هەر ئەم بەهایە ئەوەش روون دەکاتەوە، کە بۆچی دەبێ کەرەستەکانی ئەم مێژووە بەشێوەیەکی تایبەتی لەناو سەرچاوە بریتانییەکانەوە دەربهێنرێن.

بە پشتگیریی پرۆفیسۆر کارلتن .ج .هـ .هایز: ئەم کارەی ئێستە (واتە ئەم کتێبە¯و) بووە بە سەرچاوەیەکی ئەکادیمیانەی بەتام و زۆر بەبەهای راهێنانی نووسەرەکەی. لە هەموو قۆناغەکانی ئەم تێزەدا نووسەر سوودی گەورەی لە ئامۆژگارییە هۆشیارانەکان و رەخنە زانستییەکانی پرۆفیسۆر هایز وەرگرتووە. بۆیە ئەم کارە دەگونجێ لەگەڵ ئەو فێرکردنە بالآیەی ، کە هەر لەسەرەتاوە نووسەر لە پرۆفیسۆر هایزی وەرگرتووە، بۆیە تا چەند قوتابییەك بتوانێت قەرزاریاری مامۆستایەك بێت، ئەوەندەیش نووسەر قەرزاریاری ئەم مامۆستا بەتوانا و هۆشیارەیە. بۆیە لەگەڵ سوپاس و پێزانینی لەدڵەوە ئەم هەست بە چاکەکردنەی لێرەدا بۆ تۆمار کراوە.

هەروەها سوپاسی (پرۆفیسۆر ج .ب .برێبنەر) دەکەم و هەست بە چاکەکانی دەکەم و هەمان شتیش بۆ پرۆفیسۆر (سی. و. کۆڵ) بە ئەرکی سەرشانم دەزانم.

## سەرەتاکان، پێش ١٧٩٨

لە هەوڵە سەرەتاییەکانیاندا بۆ بازرگانی کردن لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا و بەناو ڕێگا وشکانییەکانی سەرزەویدا، بازرگانە بریتانییەکان دەبوو بەناو خاکی عوسمانییەکاندا تێپەڕن، بۆیە دەبوو بەڵێنی دابینکردنی ئاسایش و مامەڵەی دادپەروەرانە لە سوڵتان وەربگرن. بەدیوێکی تریشدا، ڕێگایەکی تریش گیرایەبەر، کە هەمووی ئاویی بوو، ئەمەیان لە (رأس الرجاء الصالح-سەری ئومێدی باش-Cape of Good Hope)ەوە بوو، لێرەوە پەیوەندییان لەگەڵ ناوەندە بازرگانییەکانی کەنداوی فارسدا دروستکرد، لێرەشەوە و بەماوەیەکی کاتی توانییان بەندەرێك بۆ خۆیان دروست بکەن. بەمەش ئیستەنبوڵ و کەنداوی فارس زوتر بوونە ئەو ناوەندانەی، کە لێیانەوە کاریگەریی بریتانیا توانیی ئامبازی میسۆپۆتامیاش بێت.

### ١-ڕێپێدانە بەراییەکان لەلایەن ئاستانەوە

پێدەچێت لە مێژووی تازەدا (ئەنتۆنی جێنکنسن) یەکەمین بازرگانی ئینگلیز بووبێت پێی نابێتە ناو بەشە ئاسیاییەکەی تورکیاوە. ئەم کابرایە لە ساڵی (١٥٥٣) دا لە حەڵەب ڕێپێدانێکی لەلای سوڵتان سولەیمانی گەورە وەرگرتووە، کە ئەمیش بە هەمان شێوازی خەڵکە فرەنسی و ڤینیسییەکان لە تورکیا بازرگانی بکات. داوای ئەوەشی لێ نەکرابوو، باجێکی زیاتر لە باجی ئاسایی بدات.[1] بەڵام ئەم کارەش بواری ئەوەی نەڕەخساند چالاکییەکی بازرگانیی گەورە دەست پێبکات ئەگەرچی لەساڵی (١٥٥٣) دا ئەو ئیمتیازە درابوو بەو خانەدانە گەورەیە (مستەر ئەنتۆنی جێنکنسن) و تا بەلای کەمەوە دو دەیەی

---

[1] Epstein, M. , The Early History of the Levant Company(London (London, 1908), 7-8.
هەروەها هەژمارێکی گشتی لەلایەن زانای شارەزا سێر ویلیەم فۆستەرەوە
England's Quest of Eastern Trade (London (London, 1933)

پاشتریش ئەو بازرگانی کردنە هەر بە فەرامۆشکراوی مایەوە.[2]

رووداوێکی تر، کە بۆ خۆی وەکو روداوێکی گرنگ سەلێمنرابێ و لەوانەش بێت وەك دەستپێکردنی چالاکیی بازرگانی کردنی بریتانیا دانرابێت لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، لە سالّی (١٥٧٥) دا روویداوە. لەم سالەدا بوو سێر (ئێدوارد ئۆسبۆرن) و (ریچارد ستەیپەر) بەرێوەبەرانی ئەو کۆمپانیایەی، کە بەناوی (کۆمپانیای رۆژهەلات) ەوە ناسراوبوو دوو تەتەری خۆیانیان نارد بۆ ئیستەنبولّ بۆئەوەی رێگە بۆ هاتنی (ویلیەم هاربۆرن)یش خۆش بکات. هاربۆرنیش کاربەدەستی سێر ئەدوارد بوو. ئەرکەکە سەرکەوتووانە ئەنجام درا و لە مانگی (تشرینی یەکەمی ١٥٧٨) دا بە گەشتێکی نهێنی بەسەر زەویدا هاربۆرن گەیشتە ئیستەنبولّ.[3]

گرنگیی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی هاربۆرن بوو، ئەوە بوو بەراستی بناغەی پرۆژەیەکی بازرگانیی دانا بۆ هەر پیاوێکی ئینگلیز ، کە لەناو هەر مولّکێکی تورکیادا، بێگومان بە میسۆپۆتامیاشەوە بیانەوێت، بتوانن بازرگانی بکەن. هاربۆرن توانیبووی نامەیەك لە سولّتان موورادی سێیەمەوە بۆ شاژنە ئەلیزابیس دابین بکات، ئەو نامەیە بە بەرواری (١٥/ئادار/١٥٧٩) بوو. لەو نامەیەدا سولّتان بەلّێنی ئەوەی دابوو، کە (هەمیشە ولاتەکەی کراوە دەبێت بۆ بازرگانە ئینگلیزەکان. (هەروەها ئێمەیش) بۆ ئەوەی سوود لە وتە نووسراوەکانی سولّتان وەربگرین (هەرگیز کۆ لەوە ناکەینەوە کۆمەك و فریادرەسی هەرکامیان بین، ئەگەر بمانەوێ رێز لەم هاورێیەتی و داوا و یارمەتییەمان بگرین، ئێمە بە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین بە هەموو مەبەستێکی باشەوە بەتەنگ ئەم چاکەیەوە بین).[4]

لەوەناچێت، نامەکەی سولّتان، کە بە ئاوازێکی زۆر بەرێزانەوە نووسرابوو، هەروەها ئەو ئیمتیازە رژدانەش کە بەرامبەر خواستە بریتانییەکان بەخشرابوون، بەپێی پێویست حکومەتی بریتانیایان قایل کردبێ. بەدلّنیاییەوە نامەکە لە هەندێ شوێنیدا زۆر

---

[2] Haklyut, Richard, The Principal Navigations, Voyages, Traffiques and Discoveries of the English Nation (Glasgow 1903), V, 168: Lardner, Dionysius (ed.), The History of Maritime and Inland Discovery (London, 1830), II, 187-190; Birdwood, Sir, G. C. M. , Report on miscellaneous old records at the India Office (London, 1890), 195.

[3] Miles, S. B. The Countries and Tribes of the Persian Gulf (London, 1919), I, 205.
ئەم گەشتە بە نهێنی هێلّرایەوە، لە ترسی ئەوەی نەوەك ڤینیسییەکان لەلای کۆشکی ئیمپراتۆریایی عوسمانی وا هەلّسوکەوت بکەن، خۆیان لە بەرامبەر ئینگلیزەکاندا هاوسەنگ بکەن.

[4] Haklyut, op. cit. V, 170; .١٧١-١٦٩ , دەقی نامەکە ، سەرچاوەی پێشوو

گشتییانه بووه. سولتان هەر ئەوە نەبووە ویستبێتی لەنامەکەیدا چەند ئیمتیازێك ببەخشێت، بەڵکو ویستویەتی هەلی ئەو نامەناردنە بقۆزێتەوە و ئەوە پیشانی شاژن بدات، کە خۆی چەند کەسێکی خانەدان و مرۆڤ دۆست بووە. لەبەرئەوەی هەموو موڵکەکانی ئەو کراوەبوون بۆ هەموو بازرگانەکانی (دوژمنان و دۆستان ) زۆر بەدڵنیاییەوە ئارەزووی ئەوەشی هەبوو بەرووی خواستەکانی شاژنیشدا دۆستانە و یارمەتیدەر بێت، لەبەرئەوەی (شاژن شکۆدارییەکی پادشایی زۆر مەزنی هەبوو، پڕبوو لە نیازپاکی، هەموو جۆرەکانی هەستی خۆشەویستیی هەبوو.) بەرامبەر بە سولتان. بەڵام بەلای شاژنی سەلارەوە ئەم شتە گشتییانە زیادەیەك بوون و خرانە سەر ئەو راستییەی، کە خودی نامەکە لەلایەن کەسێکی تایبەتەوە بەدەست هێنراوە و بەڵگەیەکی وای تێدابوو شاژن تێبگات ئەو بەڵێنانە قایلکار نین.

بەڵام ئەم رووداوە وای لە شاژن کرد بکەوێتە سەودای بەدەستهێنانی بەڵگەیەکی (دۆکیومێنتێکی) فەرمی و ووردتر و روونتر بۆ تێگەیشتن. لەم رووەوە و بۆ ئەم مەبەستە نامەیەکی نارد بۆ سولتان و تێیدا ئاماژەی بەوە کردبوو، کە ئەمیش لەلای خۆیەوە، لە ناوچەکەی خۆیدا هەمان ئیمتیاز دەبەخشێتە بابەتە بازرگانییەکانی عوسمانییەکان.[٥] بە گەیشتنی ئەم نامەیە، سولتان لە سالّی (١٥٨٠)دا پەیماننامەیەکی دەرکرد، تێیدا ئیمتیازی تەواو دەبەخشێتە بازرگانە ئینگلیزەکان. ئەم پەیماننامەیە دەبێتە یەکەمین بەڵگەی ئەنگلۆ– عوسمانیی لەم شێوەیە. ئەم دەقی راگەیاندنەی خوارەوە بەشێکە لەو پەیماننامەیە وەرگیراوە و بەڵگەیشە لەسەر ناوەرۆکەکەی:

(لەبەرئەوە ئێمە رێگە بە هەموو خەڵکەکەی (خاوەن شکۆ شاژنی بریتانیا) و بازرگانەکانیشی دەدەین، کە بەرێگەیەکی ئاشتییانە و بێوەییانە بێنە ناو موڵکە ئیمپراتۆرییەکانی ئێمەوە بە هەموو کارە بازرگانی و کاڵاکانیشیانەوە بەبێ ئەوەی هیچ ریگرییەکیان لێ بکرێ، هاتوچۆی خۆیان بکەن، دابوونەریتی خۆیان بەکاربهێنن، بەپێی مۆدێلی باوی تایبەت بە وڵاتی خۆیان کڕین و فرۆشتن بکەن.)[٦]

ماوەیەکی زۆر نەبوو ئەو پەیماننامەیە خرابووەگەڕ، باڵوێزی فەرەنسا لە ئیستەنبوڵ (م. دی. جێرماینی) هەوڵیدا ئەو بیروبۆچوونانەی سولتان لەبارەی ئینگلیزەکانەوە هەڵگەڕێنێتەوە. ئەم هەوڵانەیشی بۆ ماوەیەکی کاتی سەرکەوتوو بوون. وەك

---

[5] بۆ بینینی دەقی نامەکانی شاژن، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧٥–١٧٨.

[6] Haklyut, op. cit., V, 185; text of the charter, ibid, 183-189; Epstine, op., cit., APP. VIII, No. I

سەلمێنراوە، ئەو پەیماننامە نووسراوە بەزوویی و بۆ ماوەیەکی کاتی بوو بە پەیامێکی مردوو.[7]

بەڵام (هاربۆرن) لە هەوڵی سەرلەنوێ گەڕاندنەوە و جەخت لێکردنەوەی ئەو ئیمتیازانەی ئینگلیزدا نائومێد نەبوو، بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری دووجار سەردانی ئینگلتەرای کردەوە. لەسەردانەوەی دووەمیدا بەڵێنی ئەوەی لە شاژنە ئەلیزابیس وەرگرت، کە ئەم وەك باڵوێزی خۆیان بۆ ئیستەنبوڵ دیاری بکات و دەسەڵاتی سەرۆکاری کردنی هەموو بابەتە بازرگانییەکانی ئینگلیزی ناو تورکیای پێبدات. هەروەها بەرپرسیارێتیی دەستنیشانکردنی کونسوڵ و ڕێکخستنی کاروبارەکانی حوکمکردنی چالاکییەکانی ئینگلیزی ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیشی پێدرا.[8]

ئینجارە کە گەڕایەوە بۆ ئیستەنبوڵ بەرپرسیارێتییەکی سیاسیی هەبوو، چەند نامەی ڕاسپاردن و دیاریی بۆ سوڵتان پێبوو. لە ڕۆژی (٣/مایس/١٥٨٣) دا دیاری و بەڵگەکانی خۆیی پێشکەش کرد و بەزووییش پەیماننامەکەی زیندووکردەوە. بۆیە ئەرکەکەی لەوێ چۆن تەواو ئابوورییانە دەستی پێکرد، بە وەرچەرخانێك بە هەمان شێوە بوو بە سیاسییش. چۆن وەك بریکاری بازرگانی بەسەر سکەی پارەی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتەوە کاری دەکرد، وەك باڵوێزیش لەلایەن حکومەتی بریتانیاوە ڕاسپێردرا و متمانەی پێدرا. تا ساڵی (١٨٠٣) یش باڵوێزی بریتانیا لە ئیستەنبول لەلایەن ئەو کۆمپانیایەوە دیاری دەکرا و مووچەشی پێدەدرا.[9]

لەوە ناچێت ڕەچەڵەك و گەشەی پەیماننامەکانی بریتانیا، یان بڵێین ئیمتیازاتەکانی ئەوان لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، بەپێی پێویست لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابێ.[10]

---

[7] Epstine, op. cit. , 11- 12.

[8] بۆ بینینی دەقی ئەم بەڵگەنامەیە بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Hakluyt, op. cit., V, 222 - 224

[9] Miller, William, The ottoman Empire and its successors, 1801-1922(London 1936), 13; Epstine, op. cit., 74.

[10] یەکەمین باڵوێزی بریتانیا بۆ تورکیا(ئێدوارد بورتن) بووە، لەساڵی (١٥٩٣) دا نێردراوەتە ئیستەنبوڵ
Hammer, J. de, Histoire de l'Empire Ottoman, XVII, 134
ئەگەرچی سێر ئێدوین پیرس وا ناوی (ویلیەم هاربۆرن) ی بردووە، کە یەکەمین باڵوێزی ئینگلیزی بووبێت بۆ لای سوڵتان و گەشتنەکەشی بە ئیستەنبوڵ لەساڵی (١٥٨٣) دا بووبێت Pears, Turkey 388 and its ئەمە هەموو ئەو شتانەیە کە ئێمە لەبارەی ڕەچەڵەکی پەیماننامەکانەوە لەناو تێزی دکتۆرای ◄◄

ئەگەرچی لەم کارەی ئێستاشماندا تەنها ئەو روانەی ئەو پەیماننامانەمان بە هەند وەرگرتووە، کە پەیوەندییان بە مەسەلەی بابەتەکەی ئێمەوە هەیە.

یەکەمین دەرکەوتنەکانی پەیماننامەکانی بریتانیا لەساڵی (١٥٨٠) دا بووە، بەڵام سێ ساڵ لەپاش ئەو بەروارەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە. لە دووسەدەی پاشتردا و بەتایبەتییش لە ساڵانی سەدەی حەڤدەدا بریتانیا چاوی بڕیبووە کۆمەڵە ئیمتیازاتێکی نوێی تر و چەندجاریش ئەو کۆنانەی خۆیی هەموار و ساغ کردۆتەوە. بەڵام تا سەرەتای سەدەی نۆزدە هیچ کامی ئەو پەیماننامانە وەك دەستوورێکی دیار و پشت پێبەستراو لەبەرچاو نەگیرابوون. کاری کۆکردنەوەی بەڵگەنامەیی لەگەڵ پەیماننامەکانی ساڵی (١٨٠٩) دا دەستی پێکردووە و باسی لەوانەی ساڵی (١٦٧٥) کردووە، کە سەرەتایی بوون و کەموکورتییان تێدابووە و شتی سەرپێیی بوون.[11]

جگە لەوەش ئەو ئیمتیازانەی زوو لە دەمێکی تایبەتدا گرنگیی خۆیانیان هەبووە، لەو دەمەدا کە پەسەندبوون، ئەگەر لە جارێکیشدا فەرامۆشیان کردبا، لەوانەبوو لە جارێکی تردا لەبەرچاوبگیرانایەتەوە.

جیاوازیی گەورە و بەرچاو لەناو بەندەکانی هیچ کامی ئەم پەیماننامە بەراییانەدا دەرناکەوێ. لە پەیماننامەکەی ساڵی (١٥٨٠-١٥٨٣) دا ئەو ڕێپێدان و ئاسانکارییە خوازراوانەی بریتانیا داوای کردبوون، بوون بە مۆدێل بۆ هەموو ئەو بەڵگەنامانەی تر ، کە تا ساڵانی سەرەتای سەدەی نۆزدە لەو بوارەدا پێکدەهێنران. لەساڵی (١٦٠٤) دا بریتانیا داوای ئەو مافەی کرد کە چونە بەندەرەکانی عوسمانیەکان بۆ بازرگانیکردن ئاڵای وڵاتی خۆیان هەڵبدەن (دیارە بەسەر پاپۆڕەکانیانەوە-و) ئەم داوایە لە کاتێکدا بوو، کە جگە لە خەڵکی ڤینیسیا هەموو نەتەوەکانی تر بۆ چوونە ئەو شوێنانە ئاڵای

---

The Capituality Regime of Turkey; its history, origin and nature, Baltimore, 1933, by Sussa, Nasim. See p. 60n

لەبارەی گەشەکانی سەرەتاوە تەنها یەك ئاماژە لەناو ئەم دەستنوسەشدا هەیە, ئەویش هەر لە لاپەرەی(٦٠ن) دایە لەناو وتاری (٤) (هێرتزل- مامەڵە بازرگانییەکان) ٢ , ٢٧٥ (راستتر ٣٧٢) بەڵام هەر ئەم وتارە چەندان ئاماژەی دڵنیای لەبارەی پەیماننامەکانی ساڵانی (١٦٧٥) و (١٨٠٩) وە تێدایە. لەو پەرەگرافەی خوازراوەی سەرەوەدا، وا ناوی (ئێدوارد بۆرتن) هاتووە، کە دڵنیان لەوەی بەدوای (هاربۆرن) دا هاتووە، بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە :

Purchas, Samuel, His Pilgrimes (London, 1625), II, lib. VIII, 1337; Miller, op. cit. 13; Epstine, op. cit., 75

[11] British and Foreign State Papers, I, 747; Hertselt, Comercial Treaties, II, 346, 373; Farley, J. Lewis, Turkey (London, 1866), 280.

فرەنسا هەڵبکەن.[١٢] لەساڵی (١٦٤١) دا چارلسی یەکەم لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا ڕێکەوتننامەیەکی گرێدا، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە کۆمپانیای ڕۆژهەڵات بۆی هەبوو ئازادانە بازرگانی لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بکات.[١٣] لەساڵی (١٦٧٥) دا پێداچوونەوە و جەختکردنەوە لەسەر پەیماننامەکانی ساڵی (١٦٦١) کرایەوە. بۆیە ساڵی (١٦٧٥) یش بە دووەمین ساڵی لوتکەیی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی دەستکەوتەکانی بریتانیای پێش پەیماننامەکانی سەدەی نۆزدەیەم. لەپاش ئەمەوە ئیتر تا ساڵی (١٨٠٩) هیچ ئاسانکارییەکی تریان لەلایەن سوڵتانەوە بەدەست نەهێنا.

ئامانجی سەرەکی لەم پەیماننامانە ئەوە بوو بازرگانی بریتانی مافی بازرگانیکردن لەگەڵ عوسمانییەکاندا بەدەستبهێنێت و بشتوانێت کاڵاکانیشی بەناو خاکی ئەواندا هاتوچۆ پێبکات، هەروەها ئارامی و سەلامەتیی خۆی و کاڵاکانیشی دابین بکرێ. هەمان ئەم ئیمتیازانەش بەناو بۆ بازرگانە عوسمانییەکانیش لەناو خاکی بریتانیادا دابین بکرێ. ئەگەرچی دەستکەوتی ڕاستەقینە لەم پەیماننامانە بۆ سوڵتان و پاشاکانی ئەو بوو، چونکە بازرگانە بریتانییەکان دەبوو باجی (٣٪) ی نرخی کاڵاکانیان بدەن بەوان.

لەسەر کاغەز و بەنووسین ئەمە ناوەڕۆکی پەیماننامە سەرەتاییەکان بوو، بەڵام لەڕووی پراکتیکییەوە کەم جار بە تەواوی بەو شێوەیە پیادە دەکران. تەنانەت ئەگەر سوڵتانیش بیویستبا بەرژەوەندییەکانی خۆی لەبەرچاو بگرێ، نەیدەتوانی بە تەواوی پاشاکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات. ئەم شتە بە تایبەتی بۆ ناوچەی میسۆپۆتامیا ڕاست بوو، چونکە فەرمانڕەواکانی ئەوێ تەنها ناوەکەیان نەبێت، کە سەر بە عوسمانییەکان بوو، ئیتر لە هەموو شتەکاندا سەربەخۆبوون. لەم هەرێمەی میسۆپۆتامیادا سەلیقەی شت چارەسەرکردنی پاشاکان، نامەی واسیتەکاری، خەڵات و دیاری دان بە بازرگانە بریتانییەکان لەم هەرێمە دورەدەستەدا چارەسەرێکی خوازراوتر و باشتر بوو لە بەڵگەنووسراوە ئەنگلۆ عوسمانییەکان.[١٤]

---

[12] Miller, op. cit., 2

[13] Bruce, John, Annals of The Honorable East India Company (London, 1810), I, 67.

[14] Longriggs, S. H., Four Centuries of Modern Iraq (London, 1925) , 108.

### ٢- سەرەتاکانی بازرگانیی ترانزێتی (گواستنەوە)

هەموو پەیماننامە بریتانییەکانی پێش سەدەی نۆزدە بەشێوەیەکی سەرەکی، بەو جۆرە دارێژرابوون خزمەت بە کار و پێویستییەکانی (تورکیا و کۆمپانیای رۆژهەڵات) بکەن. بریکارەکانی ئەو کۆمپانیایە یەکەمین کەسانێکی بریتانی بوون لەسەردەمی مۆدێرندا قاچیان خستبێتە ناو خاکی میسۆپۆتامیاوە.

لەپاش چەند ساڵێکی کەمی سکپڕی (کۆمپانیای رۆژهەڵات) لەساڵی (١٥٨١) لە لەندەن لەدایکبووە. بەشێوەیەکی سەرەکی بەتەنگ ئەوەوە بووە بەناو رۆژهەڵات و کەنداوی فارسدا بچێت و بازرگانی لەگەڵ هیندا بکات. بۆیە بازرگانەکانی لە رێگەی حەڵەب و بەغداوە بەناو میسۆپۆتامیادا رۆیشتوون.[١٥]

(پورچاس) ناوی (جۆن نیوبری) دەهێنێت و دەڵێت ئەو یەکەمین کەس بووە و لە ساڵی (١٥٨١) دا بەوێدا گەشتی لەو شێوەیەی کردووە. بەڵام ئەوەش سەرکێشییەکی تایبەت بووە کردوویەتی.[١٦] دوو ساڵ پاش ئەوە نۆ یان دە بازرگانی تری ئینگلیزی سەر بە کۆمپانیای رۆژهەڵات گەشتێکی تریان لە لەندەنەوە بۆ هیندستان رێکخستووە. بەو مەبەستەی بتوانن پەرە بە ئەو بازرگانییە بدەن، کە تازە لە رۆژهەڵات دەستیان پێکردبوو. ئەوانیش بریتی بوون لە:_(جۆن نیوبری، رالف فیچ، جۆن ئێڵدرد و شەش، یان حەوت کەسی تریش بوون، کە ویلیەم لیدز و جەیمس ستۆرەی) یان لەنێواندابووە.[١٧] لە رێگاکەیاندا بەرەو هیندستان بەناو دەریای سپیی ناوەڕاستدا بەرەو

---

[15] Birdwood, op. cit. , 195-196.

[16] Purchas, op. cit. , II, lib. IX, 1410-1413; see also ibid, V, 579

لەبارەی بازرگانیکردنی بریتانیا لەگەڵ ئیندیزی رۆژهەڵاتدا بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٤٨٤-٤٨٧) کە راگەیاندنێکی سەرنجڕاکێشی تێدایە لەبارەی بیرکردنەوەکانی پورچاسەوە لەسەر ئەوەی چۆن سەرکێشە بریتانییەکان لە رۆژهەڵاتدا کاریان لەسەر سەرمایە و ئاین و کێبەرکێکردن کردووە. بۆ نمونە لەبارەی سەرکێشییەکانی (نیوبری)یەوە بڕوانە فۆستەر — بەشی حەوتەم.

[17] Foster, op. cit. , Chapter VIII; Lardner, op. cit. , II, 191; Pinkerton, op. cit., IX, 406; Miles, op. cit., I, 205; Curzon, G. N., Persia and Persian Question (London, 1892), II, 416.

(تەواوکاری پەراوێزی لاپەڕەی پێشوو) ئەم چوار سەرچاوەیە تەنها باس لەو چوار بازرگانە دەکەن, کە گەشتیان کردووە. بەڵام (جۆن ئێڵدرد) کە گەشتیاری پێنجەمی پاڵ ئەوانە دەڵێت :"من لەناو پاپۆڕێکدا، کە ناوی (زە تایگەر) بوو لە لەندەن دەرچووم لەگەڵ مستەر جۆن نیوبێری و مستەر راڵف فێچ و شەش یان حەوت بازرگانی جدیی تردا لەرۆژی دووشەممە سوورەی ١٥٨٣ دا" بڕوانە:

Halkuyt, op. cit. , VI(1904), I.

هەروەها بۆ زانیاریی ویاتر لەبارەی ملی دەریاگرتنی ئەم بازرگانانەوە بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو, بەشی پێنج, لاپەڕە ٤٢٥-٥١٥ و بەشی شەشەم لاپەڕە ١ — ١٧.

کەنداو، بەناو ترابولس و حەڵەب و بیر و بەغدا و بەسرە و پاشانیش هورمزدا تێپەڕیوون. دووایی کە (ڕاڵف فیچ) بە تەنها گەڕاوەتەوە بە میسۆپۆتامیادا تێپەڕیوە، ویستویەتی سەفەرەکەی خۆش بێت،[18] بۆیە لەنێوانی بەغدا و بیردا سەردانی سێ شاری تریشی کردووە، ئەوانیش (موسڵ و ماردین و ئۆرفە) بوون.

لەراپۆرتی خۆیدا (فیچ) دەڵێت بەغدا ناوەندێکی گەورەی بازرگانیکردنی گواستنەوە بووە، بەناو بەغدادا چەندان کاروان بەرەو ئێران، تورکیا، عەرەبیە (مەبەست لە عەرەبیی سعودیەیە-و) و شوێنانی تر تێپەڕیون.[19] بەسرە ناوەندێکی گرنگی بازرگانی کردنی داو و دەرمان بووە، بەڕوونی دیاربووە، کە ئەو داوودەرمانەی لە هیندەوە، یان لە بەندەرەکانی باشووری ئێرانەوە بەناو هورمزدا بۆ هاتووە. ئەم دوورگە زۆر بێ پیت و بێ بەرهەمە لەمیانەی بازرگانیکردنەوە گەشەکردنێکی باش و بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە. شوێنە ستراتیجییەکەی دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی کەنداوی فارسەوە و بووەتە ناوەندێکی سروشتیی بازرگانی کردنی نێوانی هیندستان و ئێران و میسۆپۆتامیاوە. لێرە دەتوانیت هەموو جۆرە کالایەك ببینیت:- (داودەرمان- دەرمانی پزیشکی، ئاوریشم، جلوبەرگی ئاوریشم، قوماشی چنراوی جوانی ئێرانی، کۆگای گەورەی ئەو مرواریيانەی لە دورگەی (بەهریم- بەحرەین)ەوە دەهاتن وباشترین مرواریی خەڵکانی تریش، چەندان ئەسپی جوانی ئێرانی ).[20]

هۆکارو پاڵنەرێکی ئەم سەرکێشییە بەراييانەی لەلایەن بازرگانەکانی کۆمپانیای رۆژهەلاتەوە کراون ، ئەوەبووە شاژنە ئەلیزابیس ئەو ئاسانکاری و رێخۆشکردنانە بەدەست بهێنێت، کە بەدەستیهێنان. ئەوەبوو بۆ یەکەمین جار لە مێژووی خۆیاندا، بەناو میسۆپۆتامیا و کەنداوی فارس و دەریالووشی هیندییەوە گەیشتنە هیندستان و

---

[18] "The Voyage of Mr. Ralph Fitch, merchant of London, 1583-1591," in Pinkerton, John, General collection of the best and most interesting voyages, and travels in all parts of the world; many of which are now first translated into English, 17 vols. (London, 1808-1814), IX, 406-425; Purchas, op. cit. , II, lib. X, 1730-1744.

[19] پێدەچێت، بۆ بەسرە و کەنداو بووبن، هەندێ جاریش کالاکان بەرەو هیندستان بارکرابن، یان بەپێچەوانەوە، بەشێکی بۆ بازاڕی بەغدا بووە بەلام بەزۆری وەك بازرگانیی گواستنەوە، واتە ترانزێت نێردراون.

[20] Pinkerton, op. cit., IX, 407; see also ibid, 406; Purchas, op. cit., II, lib. X, 1730-1744.

هەروەها بۆ پێناسەی هورمز وچەند بەندەرێکی کەمی تری کەنداو بڕوانە:
Purchas, op. cit., II, lib. X, 1785-1787.

ئیندیزی ڕۆژهەڵات. لەڕووی بازرگانیشەوە گرنگیدان بەوشوێنانە سەرکەوتو و باش بوو، بوو بە هاندەرێك بۆ گرێدانی پرۆژەی بازرگانیی زیاتر لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا. ئەو راوبۆچانانەی لەلایەن (فیچ و نیوبری و ئێلدرید)ەوە لەبارەی ئەو هەرێمانەوە نووسراوبوون، کە سەردانیان کردبوون زۆر بەرچاوڕوونی بوون و بوونە مایەی گرنگیپێدانێکی بەردەوام.

(ئەنتۆنی شیرلی) کە لە دەروبەری سەدەی شانزەدا لە ڕێگایدا بەرەو ئێران بەناو میسۆپۆتامیادا تێپەڕیوە شتێکی زیاتر لەوەی (ڕاڵف فیچ)ی لەبارەی ئەم وڵاتەوە نەنووسیوە.[21]

لەوە دەچێت لە سەدەی حەڤدەیەمدا تەنها یەك گەشتی بەرچاوی بریتانی هەبێ بەناو میسۆپۆتامیادا.[22] ئەو گەیشتە لەلایەن (سێر ویلیەم هێدجس) ەوە بەئەستۆگیراوە، پێدەچێت ئەو یەکەمین بازرگان بووبێ لە پەیوەندی لەگەڵ کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتدا چووبێتە ئیستەنبوڵ. لەساڵی (١٦٨١) دا وەك یەکێك لە بیست و چوار بەڕێوەبەرەکەی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان هەڵبژێردرا. نزیکەی چوار مانگ پاش ئەوەش وەك بریکار و فەرمانڕەوای کاروباری کۆمپانیاکە لە کەنداوی (بەنگاڵ) هەڵبژێردرا.[23] لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ بریتانیا بەناو ئێران و میسۆپۆتامیادا هێدج لە ڕۆژی (٢١ی شوباتی ١٦٨٦)دا بە چەند باری هێستر لە کاڵای گرانبەهاوە گەیشتووەتە بەغدا. سوڵتانیش نامەیەکی واسیتەکردنی پێدابوو، ئامانجی نامەکە وەك ئەوەی هێدج خۆی باسی دەکات ئەوەبووە، سوڵتان دڵنیابێت لەوەی هێدج بەڕێز بە بەزەییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

---

[21] بۆ وەرگرتنی زانیاریی زیاتر لەبارەی سەرکێشییەکانی هەر سێ برایانی (شیرلی) یەوە، واتە تۆماس و ئەنتۆنی و ڕۆبەرت و کارە دیار و گەورەکانیان لەمێژووی ناوچەی ئێران لەو دەمەدا بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

The Shirley Brothers, by James Hutton in the Asiatic Quarterly Review, IV (1887), 118-141

گەشتە دەریاییەکەی ئەنتۆنی لە ساڵی (١٥٩٩) دا دەستی پێکردووە و سەرچاوەیەکی سەرنجراکێشیش لەبارەی گەشتەکەی دەریاییەکەی ڕۆبەرتەوە قسەی کردبێ لەمەدا هەیە:

Acts of Privy Council, 1625-1626 (London;1934), 440, 468-469

[22] ئەم تاکە نمونەیە لە سەردەمی نوێدا، لە هیچ سەرچاوەیەکدا لەبارەی گەشتەکانی ناوچەی میسۆپۆتامیاوە ئاماژەی پێنەدراوە، بڕوانە ئەم کتێبەی لۆنگریگ:

Four Centuries of Modern Iraq, Appendix I.

[23] -The Dictionery of National Biography, IX, 363-364.

هـەورەها شتێکی لـەوەش زیـاتری پێنەبێـت، کـە بـەپێی پەیماننامەکـەمان لەگـەڵ خانەدانی گەورە (مەبەست لە لایەنی بریتانیی هاوپەیمانێتییەکەیە –و) رێگـەی پێدراوە و لە دەستی من دەرهێنرابێ.[٢٤]

ئەگەرچی ئەم دەستتێوەردانەی سوڵتان بەنیوەناچڵی لەبەرچاوگیرا، هێدج بەسۆزەوە لەلایەن پاشا و خەڵکە ناودارەکانی ناو بەغداوە مامەڵەی لەگەڵدا کرا. بەڵام نەیشیتوانی خۆی لەوە دەربازبکات، کە دەبوو باجی زۆر لەسەر کاڵا گرانبەهاکانی بدات. ئەو دەبوو زیاتر لە رێژەی لەسەداسێی نرخی ئەو کاڵایانەی بدات ، کە بەپێی پەیماننامەکان رێپێدراو بوون. هەروەها دەبوو برِی باجەکەش بە بەراوردکردنی قورس بدات. بۆیە برێکی زۆری جلوبەرگی هیندی و کاڵای تری فرۆشت بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو باجانەی بدات. چونکە دەیویست بەو پارەیە باجی ئەو ئاڵتونانە بدات، کە لە ئیسفەهانەوە هێنابوونی، لەبەرئەوەی خۆی گومانی ئەوەی هەبوو، کە دەگونجێ ژیانیشی بکەوێتـە بەر مەترسییەوە، بەتایبەتییش لە رێگەی گەیشتەکەیدا لەنێوانی بەغدا بۆ حەڵەب.[٢٥]

گرنگیدانی بریتانیا بە میسۆپۆتامیا تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، هـەر بـەردەوام و تـەواویش گرنگیپێـدانێکی بازرگانییانـە بـوو. بەتایبـەتییش لەبەرئـەوەی هاتوچـۆ و گواستنەوە لەگەڵ هیندستاندا بەردەوام بوو. ژمارەیەکی باشی بریتانییەکان لە سـەدەی هەژدەیەمدا بەناو دۆڵی دوو روباری دیجلە و فوراتـدا گەشـتیان کردبـوو[٢٦] هـیچ کـام لـەم گەشــتیارە بریتانییانـــە نـــەیتوانیوە بـــەپێی هەلومەرجـــە ئـــابووری و سیاســـی و کۆمەڵایەتییـەکان خـۆی بگونجێنێت، دیـارە لەبەرئـەوەی ئـەو هەلومەرجانـە بەتـەواوی

---

[24] Hedges, Sir William, Diary, 1681-1687 (Halkyut Society ed., London, 1887), 218-219.

[25] سەربەخۆیی پاشا و نەبوونی باری ئاسایشی گشتی و بەکارهێنانی وڵاتەکە بۆ ترانزێت، زیاتر لەوەی، کە وەکو بازاڕێك وابێت، لە باسەکەی (Hedge) دا ئاماژەیان پێکراوە، ئەم هەلومەرجـە تـا دەورووبـەری ساڵی (١٨٣١) هەر بەوشێوەیە بووە، ئیتر لەوێدا عەلی رەزاپاشا لەلایەن سوڵتانەوە دەسـەڵاتی پێـدرا و چووە جێگەی دوایین پاشا، کە سەربەخۆیانەو بەدەر لە دەسەڵاتی سوڵتان کاری دەکرد. بۆ زانیـاریی زیاتر بڕوانە:

Longrigg, op. cit., 277 ff.

[26] – لیستێکی تەواوی ناوەکانیان و بەرواری گەشتەکانیشیان بەگشتی لەناو کتێبەکەی لۆنگریگ

Four Centuries of Modern Iraq, App. I, 333-335

دا دەدۆزیتەوە، تەنها باسـی (گریفیس و فرانکلین و هـاوڵ) ی تێدانییـە، باسـی ئـەمانیش لـەناو ئـەم سەرچاوەیەدا هاتووە:..((Dictionery of National Biography

جیاواز بوون له هەلومەرجە باوەکانی سەدەی پێشووتر.[٢٧] لەبەر کرانەوە و کەوتنەگەڕی ڕێگایەکی تەواو ئاوی لە بریتانیاوە بۆ هیندستان، ئیتر لەسەدەی هەژدەدا ئەو گرنگییەی بریتانیا میسۆپۆتامیای پێدەبینی کەمتربوو لەو گرنگییەی لەسالآنی (١٥٨٠) کاندا هەیبوو.

دەستکەوتە دیار و گەورەکانی شاژنە ئەلیزابیس و ویلیەم هاربۆرن و دەستە سەرسەخت و یەککگرتووەکانی بازرگانەکانی ناو کۆمپانیای ڕۆژهەلآت، کردنەوەی (سەری ئومێدی باش- رأس الرجاء الصالح) ی وەك ڕێگایەك بۆ بازرگانیکردنی بریتانیا لێکەوتەوە. ئەم رووداوە مێژووییە، بەدیوێکدا بووە هۆی وازلێهێنانی ڕێگای میسۆپۆتامیا و بە دیوێکی دیکەیشدا پەیوەندییەکی دیار و باشی بۆ بریتانییەکان لەگەڵ کەنداوی فارسدا دروستکرد. ململانەی سەخت بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کەنداوەدا زوو دەستی پێکرد، لەپاش دوو سەدە لە ململانەی سەخت، دەرکەوت بریتانییەکان سەرکەوتووبوون. ئەم ململانە درێژ و دراماتیکییە ئەلقەیەك لە زنجیرەی سەرسوورهێنەری مێژووی فراوانخوازیی ئەوروپا پێکدەهێنێت.

### ٣-بارەگا سەرەتاییەکانی ناو کەنداوی فارس

پێدەچێ سەرکەوتنە بەراییەکەی ڕێگاکەی میسۆپۆتامیا هەندێ ناکۆك و پێچەوانەبێ لەگەڵ گواستنەوەی هاتوچۆکردن بۆسەر ڕێگای (سەری ئومێدی باش). ئەو سەرکەوتن و چەشانەی لەناو راپۆرتەکانی راڵف فیچ و هاوڕێیەکانیدا، لە ساڵەکانی (١٨٥٠) دا باسکرابوون، وایانکرد کۆمپانیای ڕۆژهەلآت بە تەنگ ئەوەوە بێت لە ئاستێکی بالآتر و زیاتر لەوەی لەسەر زەوی بەڕێوەدەچوو بازرگانییەکی زۆرتر لەگەڵ ڕۆژهەلآتدا بکات. سەرباری مەترسییەکانی هاتوچۆی دەریایی لەو سەردەمە زووەدا و ڕکەبەرییە سەختە حەتمیەکەی تەك پۆرتوگالیش، کۆمپانیاکەی بڕیاری دا ئەو ڕێگایانە بگرێتەبەر، کە هەموویان ئاویی بوون. ئەم بڕیارە هەر زوو خرایە بواری جێبەجێکردن و لەساڵی(١٥٩١) دا سێ پاپۆڕ بە دەوری سەری باشووری ئەفریقیادا نێردران بۆ ئیندیزی ڕۆژهەلآت.[٢٨]

---

[27] شەڕەکانی نێوانی ئێران و میسۆپۆتامیا لە سالآنی (١٧٢٤-١٧٤٧) دا ڕوویانداوە، هەروەها لە (١٧٧٤-١٧٧٩) ئەو شەڕانەش بێبەری نەبوون لەوەی کاریگەریی خراپی خۆیان بخەنەسەر کاروباری ناوخۆیی وڵاتەکە.

[28] Miles , op. cit., I, 205; Birdwood, op. cit., 196.

ئەمە یەکەمین نوقلانە بوو. سەرەتایەکی گەورە و دیاری ئەو جولانەوەیە بوو، کە بە ماوەیەکی کەمی کاتیی پاشتر قەبەبوونێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی.

لەسالّی (١٦٠١) دا و بە یەك سالّ پاش رێپێدانی دامەزراندنەکەی لەلایەن شاژنە ئەلیزابیسەوە، کۆمپانیای رۆژهەلاتی هیندستان، بە فەرمانی (جەیمس لانکاستەر) یەکەمین باری بازرگانیی خۆیی ناردە ناو هیندستان. ئەمە بوونی سەرکەوتنێکی گەورەی سەلماند، بارەکە لە ناردنیدا بڕی یەك ملیۆن پاوەند بیبەری تێدابوو (بە کیلۆگرام دەکاتە(٢٠٦٠٠٠) کیلۆگرام ، واتە ٢٠٦ تەن، چونکە هەر یەك پاوەند دەکاتە نزیکەی (٠,٢٠٦ کیلۆگرام)ـو).[٢٩] دووەمین باری نێردراویان دووسالّی پاشتر بوو. (بروس- کە مێژوونووسێکی کۆمپانیای رۆژهەلاتی هیندە) پێماندەلّێ ، کە قازانجی پوخت و تەواوی ئەم دووبارە بەرێژەی (٩٥٪) بووە.[٣٠] ئەمەش بەڕاستی بازرگانییەکی قازانجبەخش بووە بۆ کۆمپانیاکەو ئیتر پێویستی بەوە نەماوە لەوە زیاتر خۆی بخاتە بەرمەترسی تایبەت و هەڕەشەی تر.

یەکەمین مەترسی لەلایەن پۆرتوگالەوە پەیدابوو، چونکە پورتوگالییەکان خوویەکی وایان هەبوو ململانە لەگەلّ هەر پرۆژەیەکی کێبەرکێکاردا بکەن. ئەم توانا و دەسەلاتە دەریاییە کۆنە نزیکەی یەك سەدە پێش بریتانیا شوێنپێی خۆیی لە رۆژهەلاتدا دیاری کردبوو[٣١]، لە هەمان کاتیشدا پورتوگالییەکان ئیمتیازی باشیشیان لەو خەلّکانە وەردەگرت، کە تازە دەهاتنە ئەو ناوچانە.هەروەها بۆ بریتانییەکانیش نەدەلوا خۆیان وەکو سەرکەوتوو پیشان بدەن، چونکە کاتێکی گونجاوی وایان نەبوو داوای هاریکاریی هۆلّەندی و فارسەکان بکەن لە دژی دوژمنە ناسراو و باوەکەیان. کایەی ئەم ململانە درێژە، بەلّام لەکۆتاییدا یەکلاکراوەیە لە کەنارەکانی ئەفریقاوە درێژەی کێشا و بەرەو

---

[29] Sykes , Sir Percy, A History of Persia (2nd ed., London, 1921) , II, 188.

[30] Bruce, op. cit., I, 153. The Standard modern work is H. H. Dowell (ed.) The Cambridge History of The British Empire vol. IV: British India 1497-1858 (Cambridge, 1929)

[31] - لە سالّانی بیستەکانی (١٦٢٠) دا پورچاس زۆر بەشێوەیەکی سەرنجراکێشەرانە نوسیویەتی, کە لە سالّی (١٤٨٩) دا پورتوگالییەکان ماوەی یانزە مانگ لە لیشبۆنە ئامادەکاریی خۆیانیان کردبوو، ئینجا سوك و ئاسان دەستیان بەسەر (سەری ئومێدی باش) دا گرت، سەرەتا چوونە ناو زەریای هیندییەوە و ئینجا چوونە کەلکەتا. سەرکردەی ئەو پۆلە کەشتییە (ڤاسکۆ دو گاما) بوو، کە لەگەلّ پاشا ئیمانۆئیلدا ناکۆکیی هەبوو، بڕوانە:

Purchas, op. cit., Vol. V, Lib. V, 483

کەنارەکانی هیندستان چوو، بەڵام لەهیچ شوێنێکی تر هێندەی ئەم شوێنەیان لە کەنداوی فارس، بەباشی ئەو ململانەیە دەرنەکەوت.

لە بەختەوەریی بریتانییەکان بوو، کە رکەبەرەکانیان لەو دەمەدا بەدەست شکستی گەورە گەورەوە دەینالاند.[32] بەهۆی تێکەڵیی وڵاتەکەیانەوە لەگەڵ ئیسپانیادا، لە (١٥٨٠ – ١٦٤٠) یەکە پورتوگالییەکان لە رۆژهەڵات پاڵپشتی و کۆمەکی کەمیان بۆ دەهات و لە هەمان کاتیشدا دەبوو لەگەڵ ئەو بێزاری و کاردانەوەی خەڵکدا رووبەڕوو ببنەوە، کە لە هەموو شوێنێکەوە لەبەرامبەر سیاسەتە کۆنەکانیان (هێندەی یەك سەدە کۆن بوون) دروست دەبوو. لەپاڵ ئەوەشدا، شاعەباسی گەورە، کە لە (١٥٨٧–١٦٢٩) فەرمانڕەوایەکی چالاکی ئێران بوو، خۆی وەك دوژمنێکی تەواو سەرسەخت سەلماند. توانیی لە ساڵی (١٦٠٢) دا لە دورگەکانی بەحرەین دەریان بپەڕێنێت. هەروەها لە ساڵی (١٦١٤)شدا توانیی فەرمانڕەوایی (گەمبروون)[33] بگرێتەدەست، کە تا ئەو کاتە دوو ساڵ بوو لەژێر فەرمانڕەوایی پورتوگالییەکاندا بوو. شاعەباس چاوەڕوانی هەڵوێستی باشی دەکرد لە بریتانییەکان، ئەگەر پێویستیی بە یارمەتی و کۆمەك هەبێت بۆ بەزاندنی دوژمنەکانی، بێن بە هانایەوە و یارمەتی بدەن.

لەهەمان کاتدا بریتانییەکانیش بۆ یەکەمین جار لەسەر کەنارەکانی ئێران و لەناوجەرگەی ناوچەی ناکۆکییەکانی نێوانی شاعەباس و پورتوگالییەکانەوە دەرکەوتن. لە سەرەتاکانی ساڵی (١٦١٤) دا دوو کرێگرتەی ئینگلیزی لەلایەن کۆمپانیای، رۆژهەڵاتی هیندستانەوە لە (سورات) ەوە نێردران بۆ (ئیسفەهان) بۆ ئەوەی رێ خۆشکەریی بۆ ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی لەگەڵ ئێراندا بکەن.

لە رێگەی یارمەتییەکانی (سێر رۆبەرت شێرلی) یەوە، کە باڵوێزی بریتانیا بوو لە ئێران، ئەم دوو نێردراوە توانییان سێ (فەرمان)ی رەسمی لە شاعەباسەوە وەربگرن (فەرمان– بریاری یاسایی– لە دەقە ئینگلیزییەکەشدا هەر نووسراوە فەرمان)، کە بۆ سێ فەرمانڕەوای جیاواز نووسرابوون داوایان لێدەکردن لەناو ئاوەکانی ئێراندا کارئاسانی بۆ هەموو پاپۆڕە بریتانییەکان بکەن. هەر دووساڵ پاش ئەوە و لە ساڵی

---

[32] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی سەرەتاکانی دەسەڵاتی پورتوگالییەکان لە هیندستان و کەنداودا و زانیاریی تر لەبارەی سەرکەوتنەکانی ئەلبوکریکەوە بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Lardner, op. cit., II, chapter VIII . Detailed and authenitic account of portuguess eastern enterprises is J. Strandes' Die Portugiesenzeit von Deutsch- und English – Ostafrika (Berlin, 1899).

[33] لەپاش شاوە و لە ساڵی (١٦٢٢) بەدواوە پێیگوتراوە (بەندەر عەباس).

(١٦١٦) دا فەرمانێکی تری شاعەباس لەلایەن بازرگانەکانی کۆمپانیای رۆژهەلاتی ناو هیندستانەوە بەدەستهێنرا، کە هەندێ یارمەتیی زیاتر و ئازادیی بازرگانیی تێدابوو.[٣٤]

بەم شێوەیە بارەبارە بریتانییەکانی ناو سورات هاندران و لە سالّی (١٦١٨) دا لە (یاسك) لە دەروازەکانی کەنداوی فارس دەرکەوتن. ئەم ئالۆگۆڕە بازرگانییە هەر زوو سەرکەوتویی باشی خۆیی سەلماند و بە قۆناغ گەشەی کرد و بەرفراوانتر بوو، چەند بەندەرێکی تری کەنداوەکەی گرتەوە.

لە (١٩ی ئازاری ١٦٢٠) دا (شا جەیمسی یەکەم) نامەیەکی ئاراستەی (شاعەباس) کرد، تێیدا سوپاسی ئەو چاکانە دەکات، بەرامبەر بە بازرگانە بریتانییەکان کراون، هەروەها داوای ئیمتیازی زیاتر دەکات بۆ ئەو کۆمپانیایەی، کە خەریکە کارگەیەکی رستنی ئاوریشم لە نزیك بەندەری (یاسك) دابمەزرێنێت.[٣٥]

بەلام ئەم داوایەی (شاجەیمس) هەندێ درەنگتر جێبەجێکرا، کەوتە پاش ئەو دەمەی کە پەیوەندییە ئەنگلۆئێرانییەکان بەوە فراوانتر بۆوە، کە پێکەوە چالاکییەکی هاوبەشیان لە دژی پورتوگالییەکان ئەنجامدا.

بریتانییەکان لەلای خۆیانەوە نەیاندەتوانی خۆیان لە ململانەکردنی راستەقینەی دژی پورتوگالییەکان بپارێزن، چونکە لێبڕاوانە لە هەولّی ئەوەدا بوون جێگەکەیان لێبگرن. بۆیە یەکەمین رووبەڕووبوونەوەی ئەو شتەی پێیدەوترێ شەڕی (یاسك) لە سالّی (١٦٢٠) دا رویدا. تێیدا بریتانییەکان سەرکەوتن. بەزوویش گەڕانەوە سەر ئیشوکارەکەی خۆیان، پێنج سەد و بیست بالە (شلیف) ی ئاوریشمیان برد و گەڕانەوە بۆ سورات.[٣٦]

بۆیە ئەمانیش وەك فارسەکان بوون بە دوژمنی کارای پورتوگالییەکان و هەر خۆیان بە سروشتی هەستیان بەوە کردبوو کە ئەنجامدانی هاریکارییەکی سەربازی لەگەلّ فارسەکاندا و لەدژی دوژمنە هاوبەشەکەیان سودێکی هاوبەشی بۆ هەردوولای ئینگلیزی و ئێرانی دەبێ. ئەوان گریمانی ئەوەیان دانابوو، کە ئەم هاریکاریکردنەیان چاکەیەکە لەگەلّ فارسەکاندا دەیکەن، بۆ ئەوەی وایان لێبکەن شتی باشتری نوێیان لێ بەدەستبهێنن، بەلام ئەستەم بوو شای ئێران بە گریمانی لەو شێوەیە بخەلّەتێت.

---

[34] Sykes, op. cit. , Ii, 189.
[35] - Low, C. R., History of Indian Navy (London, 1877), I, 30.
[36] Sykes, op. cit. , Ii, 190-191.

بەڵام پێدەچێ فارسەکان وایاندانابێت ئەو چاوپۆشییانەی لەبەرامبەر کۆمپانیاکەدا کردبوویان لەبەرامبەری ئەنجامدانی کاردابووە، نەک تەنها قسەوباس. زۆر بەڕوونی دیاربوو، کە سەرەکیترین هۆکاری وەرگرتن و پیشاندانی هەڵوێستی گونجاو لەلایەن فارسەکانەوە بۆ راستەوخۆ پەسەندکردنی بیرۆکەی کۆمپانیاکە ئەوەبوو پێویستیان بە یارمەتیدان هەبوو لە شەڕکردنی دژی پورتوگالییەکاندا. لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٦٢١) دا کە بازرگانە بریتانییەکان گەیشتنە (یاسک) فەرمانڕەوای کەنارەکە بواری ئەوەی نەدان بارەکانیان دابگرن تا ملیان بەوە نەدا لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمنکاریی پورتوگالییەکاندا هاوکارییان بکەن.[٣٧] بەڵام بە هەرحاڵ ئەوە مەسەلەیەکی حەتمی بوو، کە دەبوو ئەو لایەنانە پێکەوە کاربکەن. لەڕاستییشدا هەردووکیان کەوتبوونە سەر دەروازەی ئاستێکی باڵای هاریکاریی یەکترکردن بۆ دەرکردنی پورتوگالییەکان لە دورگە ستراتیجی و زۆر بەناوبانگەکەی (هورمز).

به بەرزیی سەروی کۆشکێکی دەوڵەتی پادشاییەوە پرشنگی خەزێنە و دەوڵەمەندیی هورمز و هیند دەبریقێتەوە، لەم رۆژهەڵاتە نازدارەدا رێژنە بارانی زێڕ و مرواری بەسەر دەستی پادشا بەربەرییەکانیاندا دەبارێ، شەیتان بە خۆشنودی بەسەر ئەم شتانەوە دانیشتووە.[38]

(دەوڵەمەندیی هورمز) بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەلایەن (میلتن) ەوە ئاماژەی پێدراوە. هەروەها (راڵف فیچ) یش راستیی ئەو دەوڵەمەندییەی سەلماندووە، کاتێک یەکەمین حسابی خۆیی لەبارەی ئەم شوێنەوە نووسیوە. هەروەها (پیورچاس) یش وا ئاماژەی پێداوە، کە دورگەیەکە بووکی دەوروبەرەکەی خۆیەتی و بەرهەمبەخشێکی سەرەکییشە بەو بەشانەی جیهان.[٣٩] ئەوە (قەڵا بەناوبانگەکەی هورمز) بوو، کە بۆ (پتر لە یەک سەدە وای لە پورتوگالییەکان کردبوو بازرگانیی نێوانی هیندستان و ئەورووپا بەناو کەنداوی فارسدا بخەنە بەر بەزەیی و دەسەڵاتی خۆیان.)[٤٠]

دەست بەسەرداگرتنی ئەم پنتە چاولەسەرە، ئەرکێکی گرنگ و هەروەها مەترسیداریش بوو. هەر لایەک دەستی بەسەردا گرتبا بازرگانییەکی لەبار و بنکەی توانایەکی سەربازیی و هەورەها ناوبانگێکی گەورەی باشیشی بەدەست دەهێنا. ئەمە و بە دیوێکی دیکەیشدا بارودۆخەکان بۆ پورتوگالییەکان بەباشی ساز نەدەدرانەوە،

---

[37] Bruce, op. cit., I, 230.
[38] Milton, Paradise Lost, Book II, lines 1-5.
[39] Purchas, op. ciy., V, Lib, V, 580.
[40] Sykes, op. cit. , II, 193.

ئەمەش گرفتێك بوو بۆ خۆی و بۆ ئەوانەی دەستیان بەسەریدا گرتبوو، چونکە دەبوو لەدژی هەر پەلاماردەرێك بەرەڤانییەکی لێبڕاوانەی لێبکەن.

ئەگەرچی شا و هاوکارەکانی رازی بووبوون بەپیر ئەو ئەرکەوە بچن. ئەو ئەرکەی کە کاری یەکەمی ئەوەبوو پورتوگالییەکان بەدەرنرێن، دووەمیشی بریتی بوو لەو ئارەزووەی، جێگەکەیان بگرنەوە. هەر زوو ململانەیەکی چەکداریی گرنگ، لەسالی (١٦٢٢)دا بەدوای ئەم ئارەزووانەدا هات. هاوپەیمانەکان و دوژمنەکانیشیان زیانی گەورەیان لێکەوت.[41] لەپاش چەندان پەلامار و بۆژۆکردنێکی پاڵەوانانە، توانای بەرەنگاریکردنی پورتوگالییەکان بەتەواوی تێکشکا. ئەو پاسەوانانەیان، کە مابوون بەرەو باشوور هەڵهاتن، بریتانییەکانیش، کە لەو شەڕەدا سەرکەوتوو بوون دەستیان بەسەر دورگەکەدا گرت.

(پەیوەندییە سیاسییەکانی بریتانیای مەزن لەگەڵ کەنداوی فارسدا) چووە ئاستێکی چەماوەریی گشتیترەوە (لەو بەروارەی سالّی ١٦٢٢ بەدواوە، کاتێك بە رێکەوتنێك لەگەڵ شای ئێراندا کۆمپانیای رۆژهەلات لە هندستانەوە دوو پیاوی جەنگاوەری بۆ پارێزگاریکردن لە کەنداوەکە دانا).[42] ئەمەش ئەگەرچی باشترین بەروبوومی سەرکەوتنی بریتانییەکان نەبوو، بەلام داگیرکردنی هورمز بازارێکی باشتر لەو بازارەی پێبەخشین، کە خۆیان لە (یاسك) هەیانبوو. هەروەها رێگەشیان پێدرابوو، کە شوێنپێیەکی خۆشیان ببەنە ناو بەندەر عەباس و لەوێش کارگەیەکی ئاوریشم رستنیان دامەزراندبوو. بازرگانە بریتانییەکان رێگەیان پێدرابوو ئاوریشمی فارسی بکڕن و بیشیگوێزنەوە بۆ باشوور بۆ ئیسفەهان بەبێ ئەوەی باجی لەسەر بدەن. ئەگەرچی لەلایەن شاوە ئەم شتەش رەت کرابۆوە. شا بە توندی و یەکجاری ئەوەی رەت کردبۆوە ئەوان بتوانن لە هورمز یان هەر دوورگەیەکی تری ئێراندا بنکە دابکوتن.[43]

هەر هەمان ئەو سالەی، کە بانگی سەروەری و دەسەلاتی بریتانیا بەسەر دورگەکەدا

---

[41] – چیرۆکی ئەم شەڕە بووەتە داستانێك لەناو مێژووی کۆلۆنیالیی بریتانیدا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە Low, op. cit., I, 37-43.

[42] Moberly, F. J., (ed.) The Capmaign in Mesopotamia, 1914-1918 (London, 1923-1927), I, 45.

[43] - Low, op. cit., I, 44-45.

درا، بووه سەرەتایەکیش بۆ کۆتاییهاتنی رکەبەرەکانیشیان.[٤٤] ئەگەرچی ئەوەش راستە، کە لەپاش ئەوکاتەشەوە پورتوگالییەکان توانییان بۆ ماوەی سێ دەیەی تر (سی سال~و) لە سنووری کەنداوەکەدا بمێننەوە. پاش لەدەستدانی هورمز ملی رێگەیان گرت بەرەو (عووممان) و دەستیان بەسەر بەندەری (مەسقەت) دا گرت. لەوێوە، لەو بنکەیەوە دەستیان دایەوە چالاکیکردن، بە ئومێدی بەدەستهێنانەوەی دەسەلاتە لەکیسچووەکەیان. بەلام وەك دەرکەوت، هەولەکەیان نەزۆك بوو، چونکە نەك هەر بریتانیا، فارسەکان و ئیمامی فەرمانڕەوای عوممان و هەروەها هۆلەندییەکانیش بەو پڕ چەکییەوە لەدژیان بوون.

یەکەمین و دووایەمین هەولی راستەقینەی پورتوگالییەکان بۆ دەستبەسەرداگرتنەوەی هورمز لە سالی (١٦٣٠) دا بوو، کە شکستیشی هێنا. دەسەلاتیان بەسەر هەر شوێنێکی تری کەنداوەکەدا بۆ دوو دەیەی پاشتریش هەر ناجێگیر بوو. لە سالی (١٦٥٠) دا ئیمامی عووممانیش لە مەسقەت دەریکردن و[٤٥] هیچ شتێکیان بەدەستەوە نەمایەوە، تەنها چەند بنکەیەکی شاردراوە نەبێت، کە پاش ماوەیەکی کەمی تر ئەوانیشیان لەدەست دا. لەناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا هەرچی توانایەکی ئەنجامدانی کاری پراکتیکییان هەبوو لەناو کەنداودا گەیشتە کۆتایی خۆی و هیچیان بەدەستەوە نەمایەوە. سەرکەوتن بەسەر پورتوگالییەکاندا بریتانییەکانی گەیاندە نیوەی قۆناغی دەستگرتن بەسەر کەنداوەکەدا، لەم بارودۆخەدا سەرباری تێکشکانێکی کاتی ، بەدەست زۆر شتەوە دەیانناڵاند. لەم دەمەدا ئیتر دەبوو دانووستاندن لەگەل هۆلەندییەکاندا بکەن، کە ئەمانیش رکەبەرێکی نوێ و بەتواناو پڕچەك بوون. لە سالی (١٥٩٥)دا پاپۆڕە هۆلەندییەکان لەناو ئاوە رۆژهەلاتییەکاندا دەرکەوتن و هەر زوو ململانەیەکی سەختیان لەدژی پورتوگالییەکان دەست پێکرد.[٤٦] بۆ گەیشتن بە کۆمەلە ئەنجامێکی باشتر لە شەڕکردن و هەروەها لە بازرگانیکردنیشدا ، هۆلەندییەکانیش لە سالی (١٦٠٢) دا بە پێکەوەلکاندنی چەند کۆمپانیایەکی قەوارە بچووك (کۆمپانیای رۆژهەلاتی هیندستان) ی خۆیانیان دامەزراند.

---

[44] Coupland, R., East Africa and its Invaders: from the earliest times to the death of Seyyd Said in 1856 (Oxford, 1938), Particularly Chapter II-VI, relates the international rivalries near the Persian Gulf to the larger competition for Indian and African trade.

[45] - Sykes, op. cit. , II, 194; Longrigg, op. cit., 106.

[46] ئەوەش لەیادناچێت، کە لە سالانی (١٥٨٠ – ١٦٤٠) دا پورتوگال پاشکۆی ئیسپانیا بووە و ئیسپانیاش دوژمنی هۆلەندە بووە.

لەماوەی بیست ساڵی پاشتردا لەناو ئاوەکانی ئەفریقا و هندستاندا هەر سەرقاڵی لاوازکردنی دوژمنەکەیان بوون، لە هەمان کاتدا ئەو دووژمنە لە کەنداویشدا بە چالاکیی هاوبەشی ئەنگلۆ– فارسی لاواز کرابوو. کۆنترین پەیوەندی پێکەوەکردنی هۆڵەندییەکان لەگەڵ بریتانییەکاندا، لەناو سنووری کەنداودا لە کاتێکی زووی دوای داگیرکردنەکەی ساڵی (١٦٢٢) ی هورمز بوو، ئەوکاتە هەردوولایان ئاسوودەی ئەوەبوون دوژمنە هاوبەشەکەیان ئەو دەسەڵاتەی نەمابوو. ئینگلیزەکان و هۆڵەندییەکان هەردوولایان لەودەمەدا خۆشحاڵی ئەوەبوون تازە سەرکەوتن بەسەر پورتوگالییەکاندا بەدەستهاتبوو. دەستگرتنی بریتانیا بەسەر هورمزدا و ئەو تەنازولانەی بەهۆی ئەو دەست بەسەرداگرتنەوە لەلایەن شاوە پێشکەش کران زۆر گرنگ بوون. سەرکەوتنەکانی هۆڵەندە لە یەکەمین دوو دەیەی سەرەتای سەدەکەدا، بەدیوێکی دیکەدا گرنگیەکەیان لەوەی پێشوو کەمتر نەبوو، بەڵام هەر لەو دەمانەدا لە ئەفریقا و هیندستان، لەدەریادا و لەسەر وشکانییش(لە تەنیشتیشەوە زیانی زۆر) لەلایەن هۆڵەندییەکانەوە لە پورتوگالییەکان دران.

(هۆڵەندییەکان لەو دەمانەدا(٣٧) کارگە و (٢٠) قەڵا و شورابەندیان لە ئیندیزی رۆژهەڵات هەبوو.)[٤٧] لەماوەی کەمتر لە بیست ساڵی پاش گەڵاڵەبوونیەوە، کۆمپانیای رۆژهەڵاتی هیندیی سەر بە هۆڵەندە چەند ئاماژەیەکی باش و دڵنیای هەڵکشانی خۆی لەناو دەریاکانی هیندستاندا پیشان دا. لە ساڵی (١٦١٤) دا هۆڵەندە لەم ناوچەیەدا زیاتر لە (٢٧) کەشتیی پرچەکی هەبوو، سەرباری ئەو خەرجییە زۆرانەی بۆ پرچەك کردن سەرف دەکران، تێکڕای قازانجی ساڵانەیان لەنێوانی ساڵانی (١٦٠٥– ١٦١٤) لە دەوروبەری (٣١٪)دا بوو.[٤٨]

لە کۆتاییدا ئەم دوو هێزە سەرکەوتووەش کەوتنە ئەوەی ململانەی یەکتری بکەن. بەڵام ئەو ململانەیەش لەپاش ماوەیەکی هاورێیەتی و پێکەوەیی نێوانیان دەرکەوت. دەرکەوتنی هۆڵەندە لەسەر ئاوەکانی ئێران لەسەرەتاوە لەلایەن ئینگلیز و فارسەکانیشەوە پێشوازیی لێکرا، هەردوولایان ئەو خەڵکە تازەهاتووەیان وەك هاوپەیمانێکی چاوەڕوانکراو دەبینی. کابرایەکی هۆڵەندی بەناوی (هێربەرت ڤیسنیخ) ەوە لەساڵی (١٦٢٣) دا فەرمانێکی لەلای شاعەباسەوە بەدەستهێناو بەپێی ئەو فەرمانەش کارگەیەکی ئاوریشم بۆ هۆڵەندە لە بەندەر عەباس و لە تەنیشتی کارگەی

---

47 Purchas, op. cit., V, Lib. V, 483.
48 Keller, A. G., Colonization (Boston, 1908), 401-404.

ئاوریشمەکەی بریتانیاوە دامەزرێنرا: ئیدی هۆڵەندییەکان و بریتانییەکان پێکەوە شەڕی پورتوگالییەکانیان کرد. نموونەی ئەم پێکەوە شەڕکردنە، شەڕی (بەندەر عەباس)ی ساڵی (١٦٢٥)ە.[٤٩]

سەردەمی بەزینی پورتوگالییەکان سەردەمی هەڵکشان و سەرکەوتنی هۆڵەندییەکان بوو. بۆیە ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم هەرەسی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتێك و هەڵکشانی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتێکی تری بەخۆیەوە بینی، کە لەڕووی تواناوە لەوی تر کەمتر نەبوو. هێشتا پورتوگالییەکان بە تەواوی شکستیان نەخواردبوو، سیما زەق و دیارەکانی ململانەی ئەنگلۆ – هۆڵەندی بە باشیی هەست پێدەکران و کەم نەبوون.[٥٠] بەڵام تا ساڵانی (١٦٥٠) کان قورسایی ئەو ململانەو دژایەتییە بە تەواوی هەست پێنەکرا.

لەو ساڵانەدا هۆڵەندییەکان کۆنترۆڵی تەواوی بازاڕەکانی ئێران و کەنداوەکەشیان گرتبووە دەست و ئەمەش لەسەر حسابی بریتانییەکان بوو، چونکە لەو دەمانەدا ئیتر ئەوان لەم هەرێمانە وەدەرنرابوون.[٥١]

گوشاری هۆڵەندییەکان بەدیوێکدا و توانای لاوازبووی رکەبەریکردنی پورتوگالییەکان بە دیوەکەی تردا بریتانییەکانی بە دیوی بەسرەدا خستە جووڵە. لە دەوروبەری ساڵی (١٦٣٥) دا لەم بەندەرەی میسۆپۆتامیادا دەرکەوتن و سەرەتایەکی بازرگانیکردنی سەرکەوتوویان دەست پێکرد. پێنج ساڵ پاش ئەوە چەندین باری کاڵای بازرگانیی پورتوگالی ، کە لە (مەسقەت) ەوە بارکرابوون گەیشتنە بەسرە و کاڵا بریتانییەکانیان لەو بازاڕەش دایەلاوە. لەپاش ئەم روداوەوە لەپڕدا توانای رکەبەریکردنی

---

[49] Sykes, op. cit. , II, 194-195: Longrigg op. cit., 103.

[50] بۆ باسی زیاتر لەبارەی کێبەرکێ دێرینەکانی ئینگلیز و پورتوگال و هۆڵەنداوە بڕوانە کتێبەکەی(مایلز) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢٠٦–٢١٠). عەرەبەکانی کەناری رۆژهەڵاتی کەنداو، بەتایبەتییش ئەوانەی عوممان بووبوونە فاکتەری چوارەمی ناو ئەم ململانەیە. تورکەکان زۆر لەوەوە دووربوون ببنە لایەن تێیدا، لەو دەمەدا فارسیش هێزی دەریایی نەبوو.

[51] بڕوانە

Bruce, Op. cit., I, 498-499, 522

بریتانییەکان بە مردنی شاعەباس لەساڵی (١٦٢٩) دا هاوپەیمانێکی دێرینیان لەدەست دا و هەرچی هۆڵەندییەکانیشن بە سەلیقەوە هەڵسوکەوتیان کرد. ئەمان کاڵا فارسییەکانیان بە پارەیەکی زۆرباش دەکڕی و هەندێك جار پەنایان بۆ بەرتیلدانیش دەبرد. ئەوان لە بەکارهێنانی ئەو هێزەدا، کە بەکارهێنانیشی بۆ داگیرکردنی دورگەی قیشم پێویست بوو، پەلەیەکیان نەبوو.

پورتوگالییەکان لاواز بوو (هەر زوو بەسرەیش بوو بە یەکێك لە هەرە گرنگترین ناوەندەکانی ئالوگۆڕکردنی سەر بە کۆمپانیاکە).[٥٢]

لەم ڕۆژگارەدا توانای هۆڵەندییەکان بۆ ڕکەبەریکردن قەبەتر دەبۆوە و ئەمەش بۆ دەمێك بریتانییەکانی لەم هەرێمە دوورەدا هەراسان کردبوو. لە دەوروبەری ساڵی (١٦٤٥) دا گەلەکەشتییەکی هەشت پاپۆڕیی هۆڵەندە بازاڕی بەسرەی داگیرکرد و خێراش بازرگانی و ناوبانگەکەی بریتانیای وێرانکرد و تێکیشکاندن.[٥٣]

سەروەری و باڵادەستیی هۆڵەندییەکان لەناوچەی کەنداودا، کە تەنگی بە بازرگانیکردنەکەی بریتانییەکان هەڵچنی بوو، بۆ ماوەیەکی کورتخایەن بوو، هەر تەنها نزیکەی بیست ساڵێکی خایاند (١٦٥٠-١٦٧٠)[٥٤] ڕووداوەکانی سەر شانۆی ناوەوەی ئەوروپا بە ئاراستەیەکدا جوڵان، کە لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا سەروەری و باڵادەستیەکەی هۆڵەندییەکان درایە دەستی بریتانییەکان، وا ئێستا لێرەدا ڕوانینێك لەبارەی ئەو ڕواداوانەی ناو ئەورووپاوە پێشکەش دەکەین.

لە ساڵی (١٦٧٢) دا لویسی چواردە ( Louis XIV -١٦٣٨ - ١٧١٥ ژیاوە لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە پاشای فەرەنسا بووە و پێیگوتراوە پادشای خۆر- وەرگێڕ) شەڕێکی دوژمنکارانەی بە هۆڵەندە فرۆشت و پەلاماری دا. بۆیە بەهۆی ئەم پەلامارەوە هۆڵەندە ناچاربوو لە بەرژەوەندیی بریتانییەکان چاوپۆشی لەو باڵادەستی و سەروەرییانەی خۆی بکات، کە لە پشتی دەریاکانەوە هەیبوون. ئەگەرچی پێش ئەوە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم دوو نەتەوەیە لەناو یەکێتییەکی وەچەیی و بنەماڵەییدا یەکیان گرتبوو.

لەساڵی (١٦٨٨) دا شۆڕشێك لە بریتانیادا دوواین پادشای بنەماڵەی ستیوارتەکانی لەکار لادا و لەبریی ئەو (ویلیەمی سێیەم) ی کرد بە پاشا، کە بە ویلیەمی پرتەقاڵ ناسراوە و فەرمانڕەوای هۆڵەندە و مێردی کچی پاشا لەسەر کار لادراوەکەش بوو، واتە زاوای بوو. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ویلیەمدا (١٦٨٩- ١٧٠٢) ململانە ئەنگلۆ - هۆڵەندییەکە بوونی نەما و لەبری ئەو ململانەیەش هەردوو نەتەوەکە لە دژی (لویسی

---

[52] ئەم بورگە گرنگە کەوتۆتە ناو ئاوی شەتولعەرەبەوە، شەتولعەرەب ئەو ئاوەیە، کە بە یەککرتنی هەردوو ئاوی ڕووبارەکانی دیجلە و فورات دروست بووە. ئەم دوو ئاوە لە ناوچەی قورنە یەکیان گرتووە، پاشان بەیەکەوە سنووری (١٢٣) میلێك دادەپۆشن و لە فاودا دەڕژێنە کەنداوی فارسەوە. ماوەی نێوانی فاو و بەسرە(٧٥) میلە.

[53] Moberly, op. cit., I, 43; Longrigg, op. cit., 107-108.

[54] On the heyday of Dutch power in the east, see Bruce, op. cit., I, 26-39.

چواردە) یەکیان گرت. لەڕۆژگاری سالانی (١٧٠٢ – ١٧١٣) دا بریتانیا و هۆڵەندە و هەروەها دەسەلاتەکانی تری ناو ئەورووپاش لەو شەڕەوە گلان، کە بە شەڕی (شوێنکەوتنی ئیسپانیا) ناسراوە و لە دژی فرەنسییەکان بوو. لەڕووی بەرەی کۆلۆنیالی و بازرگانییەوە بریتانیا لەو شەڕەدا ڕۆڵی سەرەکیی بینی. بۆیە بەپێی ڕێکەوتننامەکەی (یوترێخت ١٧١٣) کە کۆتایی بە شەڕەکە هێنا، پاداشتی باشی درایەوە. بوو بە دەسەلاتێکی بالادەست لە ئەمریکای باکوور، هەروەها ئاسانکاریی بازرگانیی لە ئەمریکای باشووریش بۆ کرا، کە پاشتر زۆربەیان کەوتنە ژێر فەرمانڕەوایی ئیسپانیا. بریتانیاش چەند شوێنپێیەکی ستراتیجییانەی لەناوچەی دەریای سپیی ناوەڕاست بۆ خۆی پەیداکرد. بەو شەڕە هۆڵەندە لاواز بوو، نەیتوانی لە سنوورە کۆنەکانی ولاتەکەی خۆی بەولاوە هیچی دیکە بەدەست بهێنێت. ئیتر ئەوەش روون بوویەوە، کە هۆڵەندە چییتر ئەو توانایەی نەماوە لە کاروباری کۆلۆنیالکردن و بازرگانیکردندا هاوشانیی بریتانیا بکات.

لەناو ئەم گۆڕانە گەورەیەدا، کەنداوی فارس بەزوویی دەستی بۆنەبرا. نە هۆڵەندە ونە بریتانیاش هیچ حسابێکی تایبەتیان بۆ ئەم ناوچەیە نەکردبوو. هەرچی هۆڵەندەیە لە هەلومەرجێکی وادا نەبوو کار بۆ ئەو مەسەلەیە بکات و هەرچی بریتانیاشە سەرقالی چەسپاندنی دەستکەوتە نوێیەکانی خۆی بوو. بەلام پاشان لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا بارودۆخی کەنداوەکە کەوتە سەر ڕەوتی روودانی گۆڕانێکی بەرچاو. هەرچی شوێنەوارێکی دەسەلاتی هۆڵەندە لەم ناوچەیەدا مابۆوە، لەپڕدا بەتەواوی هەرەسیانهێنا و بە سەروەری و بالادەستییەکی دلنیای بریتانی جێگەکەیان گیرایەوە.

دیاربوو هۆڵەندە دەبوو پاشەکشە بکات، نەک تەنها لەبەرئەوەی نەکەوێتە بەر ڕکەبەریی کاریگەری بریتانییەکان، بەلکو بۆ ئەوەش کە پێش ئەوەی بکەوێتە بەر پەلامارە هەراسانکەرەکانی عەرەبەکانیش، ڕێگاکان بەربدات. دوواین کارگەی ئەوان قەلایەك بوو بەسەر دوورگەی (خەرەك)ەوە، لە سالی (١٧٦٦) دا کەوتە دەستی عەرەبەکان و (هەرچی چالاکیەکانی هۆڵەندە بوو لەم ناوچەیەدا کۆتایی پێهات)[٥٥]. هەروەك لە بەشی داهاتودا دەبینین بریتانییە سەرکەوتووەکانیش دەبوو لەنێوانی سالانی (١٧٤٠ – ١٧٨٣) دا لەناو دەریای هیندی و کەنداوی فارسدا ڕووبەڕووی تەحەدایەکی گەورەی فرەنسا ببنەوە.

---

[55] Persian Gulf (Hand book, London, 1920), 65.

بەگشتی لەبەرئەوەی شوێن و پایەی بریتانیا بەهێزتر بووبوو لەساڵی (١٧٧٢) دا یەکەمین نێردراوی خۆیانیان بۆ ڕوپێوکردن لە (بۆمبای) یەوە نارده کەنداوی فارس. ١٣ ساڵ پاش ئەوە کاری ڕوپێوکردنەکە لەلایەن (ئەفسەری پلە یەکەم مەك کلور) لە هێزی دەریایی هیندەوە پەسەند کرا و بەمەش (یەکەمین ڕوپێوی بەڕاستی گرنگی کەنداو بە ئەنجام گەیەندرا.)[٥٦]

لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا بریتانیای مەزن لەڕووی بازرگانی و سیاسییشەوە باڵادەستترین دەسەڵاتی زاڵی ناو کەنداو بوو.[٥٧]

زاڵبوونی ئەو لە سەرەتاوە بەهۆی نەبوونی هەر جۆرە رکەبەرییەکی راستەقینەوە بوو، نەك وەك ئەوەی سیاسەتێکی سەرنجراکێشی پیادەکردبێ. بۆیە بەهەرحاڵ، لە کۆتایی سەدەکەدا لەبەر دەروازەی ئەنجامدانی هەڵوێست گۆڕینێکی سەراپاگیردابوو، نەك تەنها بەرامبەر بە کەنداو، بەڵکو بەرامبەر بە میسۆپۆتامیا و شوێنەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش هەر بەهەمان شێوە. باڵادەست بوون لەم ناوچەیەی جیهاندا بەوشێوەیە نەبوو، کە تەنها رابوەستێتە سەر مەسەلەی ئارەزوو، بەڵکو پەیوەندیی بە پێویستبوونی ڕەهای پاراستنی بەرژەوەندی و ناوبانگی بریتانیاوە هەبوو لە ڕۆژهەڵاتدا. ئەو گۆڕانە مێژوویەی ئەو هەڵوێستە لە ئەنجامی دەرکەوتنی رکەبەرێکی نوێ و ترسناکەوە بوو، کە ئەویش (ناپلیۆن بۆناپارت) بوو. داگیرکردنی میسر لەلایەن بۆناپارتەوە و پلاندانانیشی بۆ دواتر داگیرکردنی هیندستان وای لە حکومەتی بریتانیا کرد جدییانەتر بیربکاتەوە و چالاکانەتر بکەوێتە جموجووڵ. هەر لەسەردەمی ناپلیۆنیشدا بوو، کە نفوز و کاریگەریی بریتانیا بۆ یەکەمین جار لەناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە چەسپیوی دامەزرا.

---

[56] - Fraser, Lovat, Some Problems of the Persian Gulf (London, Central Asian Society, 1908), 6.

[57] Persian Gulf (Handbook), op. cit., 68.

## کێبەرکێی ئەنگلۆ-فەرەنسی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تا ساڵی ١٨٠٢

هەرچۆن ململانەی ئینگلیز و هۆڵەندییەکان بەدوای ململانەی ئینگلیز و پورتوگالییەکاندا هات، ئاواش ململانەی ئینگلیز لەگەڵ فەرەنسییەکاندا، بەدوای ململانەیان لەگەڵ هۆڵەندییەکاندا هات. بەدڵنیاییەوە ماوەیەکی زۆر پێش رەگ داماڵینی یەکجارەکیی هۆڵەندییەکان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، سیماکانی کێبەرکێی نێوانی ئینگلیز و فەرەنسییەکان دەرکەوتبوون، بەڵام دەرکەوتنەکەی زۆر روون نەبوو تا ئەو دەمەی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا فەرەنسا بە گرنگییەوە دەیڕوانییە پایەی ئینگلیز لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و لە کۆتایی سەدەکەیشدا (ناپلیۆن بۆناپارت) رێنوێنیی هەڵپەکارییەکەی فەرەنسای کرد بەرەو ئەو ناوچەیەی، کە بریتانیا جموجوڵێکی چالاکانەی هەبوو تێیدا. ئیتر لە ساڵی (١٨٠١) دا بریتانییەکان توانییان یەکەمین سەرکەوتنی خۆیان بەسەر فەرەنسییەکاندا بەدەستبهێنن. ئەم سەرکەوتنە ئەگەرچی بەڕاستی سەرکەوتنێکی رەوتەنییانەیش بوو، بەڵام بووەهۆی ئەوەی بریتانیا بتوانێت کاریگەرییەکی (کاتی بەڵام بنچینەیی) بۆ خۆی لەناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دابمەزرێنێ.

### ١- ململانە ئەنگلۆ-فەرەنسییەکان لە پێش سەردەمی ناپلیۆنەوە تا ساڵی ١٧٩٨

بە بەراورد لەگەڵ ئەوەشدا، کە درەنگ توند و خەست بۆوە، ململانەی ئەنگلۆ – فەرەنسی سەرەتایەکی مێژوویيانەی هەیە. یەکەمین دەرکەوتنی لە ئیستەنبوڵ و لە نیوەی دووەمی سەدەی شانزەدا بووە. فەرەنسا بەنیو سەدە پێش دەرکەوتنی ئینگلیز پەیوەندیی دۆستانەی خۆیی لەگەڵ ئاستانەدا دروست کردبوو. (فەرەنسیسی یەکەم) یەکەمین رێکخەری ئەم پەیوەندییە بووە، لە ساڵی(١٥٣٥) دا توانیویەتی لەلای سوڵتان (سولەیمانی مەزن) دوە یەکەمین رێپێدانی کارکردن بۆ فەرەنسا لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بەدەستبهێنێت. لەمەوە بازرگانە فەرەنسییەکان رێگەیان پێدرابوو ئازادانە بەناو هەرێمی تورکیدا بازرگانی بکەن و بازرگانانی نەتەوەکانی تریش دەبوو لە" ژێر باڵ و پاراستنی" فەرەنسادا لەو ناوچەیەدا کاربکەن.

پاشان لەساڵانی هەشتاکانی سەدەی شانزەدا (ویلیەم هاربۆرن) توانیی سەرباری پلانگێرییەکانی (م. دی. جێرمایني) ی باڵوێزی فرەنسا لە ئیستەنبوڵ، یەکەمین ڕێپێدان بۆ ئینگلیز لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا وەربگرێ. لەماوەی ٢٠ ساڵدا ئینگلیزەکان وەك خۆشەویسترین نەتەوەی لای ئاستانە جێگەیان بە فرەنسییەکان چۆڵ کرد.

لە کۆتایی سەدەکەدا فرەنسییەکان توانییان زۆرینە بۆ خۆیان ببەنەوە و لە ساڵی (١٦٠٤) یشدا جارێکی تریش نوێکردنەوەی ڕێپێدانەکانی خۆیانیان مسۆگەر کردەوە.[58] ئیتر دەبوو بازرگانانی هەموو نەتەوەکانی تر، تەنها دوو نەتەوە نەبێت، کە ئەوانیش (ڤینیسی و ئینگلیزەکان) بوون لەژێر "پاراستن"ی فرەنسییەکاندا داوای مۆڵەتی کارکردن بکەنەوە. لەو کاتەدا ، کە واچاوەڕوان دەکرا ئیمپراتۆریای عوسمانی ببێتە ناوەندی ململانەی ئەنگلۆ – فرەنسی گۆڕانێکی کاتیی ڕێگای بازرگانیکردن لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە بۆ دەوروبەری (سەری ئومێدی باش) وایکرد پنتی ئەو ململانەیەش لە ناوچەی ئیمپراتۆریاوە بگوێزرێتەوە و هێندەی ئەوەش کاریگەریی خستەسەر بازرگانیی ڕۆژهەڵات و بەرەو ڕێگای دەریایی برد.

کۆنترین هەوڵی فرەنسی بۆ بازرگانیکردن لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا لە ڕێگەی (سەری ئومێدی باش) ەوە لەلایەن گرووپێك خەڵکی سەرکێشی نۆرمەندییەوە دراوە. ئەم گرووپە لەساڵی (١٦٠١) دا و لەژێر فەرمانی (فرەنکۆیس پیرارد دێ لەیڤەڵ) دا و لە (سەینت مالۆ) وە ملی دەریایان گرت، ئەو سەرکردەیەیش هەر بازرگانێکی ناو ئەو بەندەرە بوو. لەگەڵ گەشتنیاندا بۆ دورگەکانی (ماڵدیف) لە جەمسەری باشووری ڕۆژهەڵاتی هیندستان پاپۆڕەکەیان لە ئاودا بەر (ڕچەی مرواری و مەرجان) کەوت و بەمەش گەیشتە دەریاییەکەیان کۆتایی پێهات. ماوەیەکی کەم، پاش ئەوە کۆمپانیایەکی لاوازی فرەنسیی ڕۆژهەڵاتی هیندی دامەزرا. ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی (١٦٠٤) دا گەڵاڵە بوو. هەر ماوەیەکی کەمی خایاند و ئیتر لە یاد چووەوە. لەو دەمانەدا چەندان گرووپی بازرگانانی فرەنسی نیگەرانیی ئەوەیان هەبوو، کە چۆن بەشداریی ئەو سود و قازانجانە بکەن، کە لەو شوێنانە لەلایەن بازرگانە ئینگلیز و هۆڵەندییەکانەوە بەدەستدەهاتن. لەپاش برێکی زۆری سەرقاڵبوون بە سازشکردنەوە لەسەر ئیمتیازاتە مۆنۆپۆڵییەکان پرۆژەیەکی چالاکی فرەنسییانە بە گرتنەبەری دوو هەڵمەتی سەرکەوتووانە لە ساڵی (١٦١٦) دا

---

[58]Miller, op. cit., 2; Epstein, op. cit., 12

دەستی پێکرد.[٥٩] بەدڵنیاییەوە ئەم کۆمپانیایە لە هەلومەرجێکی وادا نەبوو بتوانێت بناغە بۆ سیاسەتێکی چالاکی فرەنسییانە لە رۆژهەڵاتدا دابمەزرێنێت.

لەساڵی(١٦٢٦) دا (کاردینال رێشیلیۆ) (لویس دیشایین)ی بە ئەرکێکی سیاسی-ئابوری نارده لای (شاعەباسی گەورە) ی ئێران. ئەرکەکەی (دیشایین) ئەوەبوو، شا قایل بکات، لەدژی تورکەکان هیچ یارمەتییەکی ئیسپانییەکان نەدات، هەروەها بۆ ئەوەش بوو، کە لەناو هەرێمی ئێراندا ئاسایش و یارمەتی بۆ بازرگانە فرەنسییەکان دابین بکات، بەڵام نێردراوەکە هێشتا نەگەشتبووە پایتەختی تورکیا سەرهەڵدانی ناکۆکییەك لەنێوانی ئەم و باڵوێزی فرەنسا لە ئیستەنبوڵ گوڵی پرۆژەکەی بە خونچەیی هەڵوەراند.[٦٠]

دووساڵ پاش ئەوە دوو قەشەی فرەنسی گەیشتنە ئێران و لەوێ بەسۆزەوە لەلایەن شاوە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا، بەڵام لەو گەیشتەیاندا سەرقاڵی مەسەلە ئابووری و سیاسییەکان نەبوون[٦١]، هەروەها گەڵاڵەکردنی کۆمپانیایەکی نوێی رۆژهەڵاتی هیندییش لە ساڵی (١٦٤٢) دا و لەلایەن کاردینال رێشیلیۆوە زۆر لەو هەوڵانەی پێش خۆی کاریگەرتر نەبوو.

کاتێکیش، کە (کۆڵبەرت) وەزیرە بوێرەکەی فرەنسا لای کردەوە بەلای رۆژهەڵاتدا و گرنگیی پێدا هیچ پشتی بەو شتانەی پێشوو نەبەست، کە هاندەر بوون، بەڵکو لەوەوە دێرینترین هەڵپەکاریی فرەنسا بەرەو ئێران دەستی پێکرد. لە ساڵی (١٦٦٤) دا و لە هەوڵێکیدا بۆ بەدەستهێنانی ئاسانکاری و رێپێدانی بازرگانیکردن باڵوێزێکی نارده لای (شاعەباسی دووەم). حکومەتی ئێران لەو راستییە نیگەران و بێتاقەت بوو، کە ئەو شاندەی فرەنسا ناردبووی، خەڵکانێك بوون، بەپێی پێویست لە ئاستێکی باڵادا نەبوون، بەتایبەتییش لەبەرئەوەی ئەوان پێشوازییەکی باشیان لە شاندەکە کردبوو، ئەو ئەرکەیش، کە بۆی هاتبوون تەواو سەرکەوتو و باش بوو. هەرچی بازرگانە فرەنسییەکانن لەوێ بۆ ماوەی سێ ساڵ لە هەر باج و زیانێك پارێزراوبوون، هەروەها ئەو هەلومەرجی ئاسانکاریی بازرگانیکردنەشیان پەسەندکرد، کە وەکو هۆڵەندی و

---

[59] Cole C. W., Colbert and Century of French Mercantilism, (New York, 1939), I,. 113-116

[60] دی ریال جیرارد: هەوڵی دانانی باڵوێزخانەیەکی فرەنسی بۆ ئێران، لەژێر سەرپەرشتیی کاردینال رێشیلیۆ، هەروەها فەرمانێکی بڵاونەکراوەی لویسی سیانزەیەم، لەبارەی کردنەوەی باڵوێزخانەیەکی فرەنسییەوە لەم سەرچاوەیەدایە:
Asiatic Quarterly Review, 3 ser., vol. 1-2, 163-180 (January, 18914)

[61] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٧٧-١٧٨.

ئینگلیزەکان پێیان بەخشرابوو.[٦٢] ئەم مەرجانە ئەگەرچی سادە و ساکاریش بوون، بەڵام هەر بەپێی ئەمانە چەند کارگەیەکی فەرەنسی لە ئیسفەهان و بەندەر عەباس دامەزران و بوونێکی لاوازیان هەبوو تا ساڵەکانی کۆتایی سەدەکەیش بازرگانیی فرانکۆ-ئێرانی هەرشتێك نەبوو شایانی باس بێت. بەڵام ، کە لە ساڵی (١٧٠٨) دا پەیماننامەیەك لەنێوانی "لویسی چواردە و شا سوڵتان حسەین" دا بەسترا بازرگانییەکەش بۆ ماوەیەکی کورتی کاتی ژیایەوە. چواردە ساڵ پاش ئەوە و لە کاتی داگیرکردنی ئەفغانستاندا فەرەنسییەکان لە ئێران چوونە دەرەوە و ئیتر بە دەرکەوتن و سەردەرهێنانی سەردەمی ناپلیۆن هیچ گرنگییەکی ئەوتۆیان بەم وڵاتە نەدا.

بەم شێوەیە و وەك لەم چەند پەرەگرافەی پێشوودا بینیمان، تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بوونی کێبەرکێیەکی راستەقینە لەنێوانی ئینگلیز و فەرەنسییەکاندا، چ لە ناوچەی ئێران و چ لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا دەرنەکەوت. ئەگەرچی لەناو کەنداوی فارسدا بارودۆخەکە جیاواز بوو. یەکەمین ئاماژەی سەرقاڵبوونی فەرەنسا بەم ناوچەیەوە، لە ساڵی (١٦٧٩) لە بەسرە دەرکەوت. لەو ساڵەدا نێردراوێکی کەرملیی بە رەگەز ئیتالی لە بەسرە، وەك کۆنسڵی فەرەنسی لەو شارە دەستنیشان کرا.[٦٣] بەڵام نوێنەرە فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکانیش لەوێ ئەرکێکی بەرچاوی وایان لەسەرشان نەبوو، تا دوادواییەکانی ساڵی (١٧٤١) یش هەر لەژێر بەزەیی و فەرمانی پارێزگارە خۆجێییەکانی ئەوێدا دەژیان.[٦٤] لە ساڵی (١٧٥٥) دا یەك مافی نیشتەجێبوون (ئیقامە) ی هەمیشەیی فەرەنسی لە بەسرە وەرگیراو ١٠ ساڵ پاش ئەوەش کونسڵێکی فەرەنسی بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستی نیشتەجێبوونە دیاریکرا.

وەك ئەوەی (سێر ئارنۆڵد. ت. ویلسن) ئاماژەی پێداوە، لە ساڵی (١٧٨٥) دا داوا لە ئیمامی مەسقەت کراوە رێگە بدات لەوێ کارگەیەك دابمەزرێنرێ، بەڵام ئەم داوایەش وەك داوا پێشووەکانی بریتانیا کە بۆ هەمان مەبەست پێشکەش دەکران، رەتکرایەوە. لەنێوانی ساڵانی (١٧٦٣ و ١٧٩٣) دا و لە کۆتایی شەڕی حەوت ساڵەوە تا

[62] Sykes , op. cit., II, 195; Curzon, op. cit., II, 549.

[63] بەسرە سەرەکیترین بەندەری سەر میسۆپۆتامیایە، هەروەها وەك گرنگترین بەندەری ناو هەموو کەنداوی فارسیش دادەنرێ.

[64] Longrigg , op .cit , III 157.

دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی ناپلیۆن، لە بەسرە تێپەڕێت، فڕەنسییەکان هیچ نوێنەرایەتییەکی ڕەسمییان لەناوچەی کەنداوی فارسدا نەبووە.[٦٥]

لەکاتی پێشبڕکێ گەورەکەی نێوانی بریتانیای مەزن و فڕەنسادا لە پێناوی ئیمپراتۆریای پشت دەریادا، کە بە شەڕی (شوێنکەوتنی نەمسا ١٧٤٠-١٧٤٨) و هەروەها شەڕی حەوت ساڵەی (١٧٥٦-١٧٦٣) و شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکا (١٧٧٥-١٧٨٣) دا دەریالووشی هیندی و سنوورەکانیشی بووبوونە زەمینەی ڕوودانی چەندان ململانەی دەریایی. فڕەنسییەکان بنکەی خۆیانیان لە مۆریشیۆس (ئیل دی فڕەنس) و چەند دوورگەیەکی نەناسراوی تر دانابوو. لەوێوە پەلاماری ئەو ڕێگا بازرگانییانەی بریتانیان دەدا، کە لە سەر و هیندەوە دەردەچوون و هەر پاپۆڕو دەستکەوتێکی ئەو پەلامارانەشیان هەبووایە، دەیانبرد لە (مەسقەت) دەیانفرۆشت. بۆیە لەمەوە زاری کەنداوی فارس بووبووە ناوەندێکی دابەشکردن بەسەر سعودیەی عەرەبی و میسۆپۆتامیا و باشووری ئێراندا.

ئەنجامی ئەمەش ئەوەبوو، کە (عوومان) وەك بەهێز ترین دەوڵەتۆکەی عەرەبی لە کەنداودا بووە زەمینەی ڕوودانی زنجیرەیەك شەڕی ئەنگلۆ- فڕەنسی.[٦٦]

یەکەمین ڕوداوی نێوانیان لەساڵی (١٧٥٩) دا بووە. کاتێك سێ کەشتی پڕچەکی فڕەنسی هەوڵیانداوە بە زۆرەملەیی ڕەوەکەشتییەکی گەورەی بریتانی لە بەندەری مەسقەت بەرنە دەرەوە. ئەم پەلامارە دوژمنکارانە لەناو ئاوە هەرێمایەتییەکانی مەسقەتدا سوکایەتییەك بوو بە (خەلفان بن موحەمەد) ی فەرمانڕەوای بەندەرەکە کرا، بۆیە ئەمیش کەوتە تەقەکردن لە پاپۆڕە پڕچەکەکانی فڕەنسا و ناچاری کردن لە ڕێگەکە لابدەن. وەك تۆڵەکردنەوەیەك لەم پەنەی بەسەریاندا هات، گەورەترین دانەی سێ کەشتییەکە ملی ڕێگەی گرت بەرەو بەندەر عەباس، لەوێ پەلاماری کارگەیەکی بریتانیی دا و نیمچە وێرانی کرد.

هەوڵێکی تری کەشتیی پڕچەککراوی فڕەنسی بۆ ناچارکردنی پاپۆڕی ئینگلیزی و دەرکردنی لە ئاوەکانی مەسقەت لە ساڵی (١٧٦١) دا ڕوویداوە. ئەمەشیان هەر بەهەمان شێوە لەلایەن هەمان والیی بەندەرەکەوە پوچەڵکرایەوە. سێیەم ڕوداوی گەورەی لەم

---

[65] Wilson, A. T. , The Persian Gulf (Oxford, 1928), 189; Longrigg, op. cit., 187.

[66] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم ململانە ئەنگلۆ- فڕەنسییانەوە بڕوانە:

Auzoux, A., "La France et Muscat aux XVIIIe et XIXe siecles," Revue d'histoire diplomatique , XXIII (Paris, 1909), PP.518-540; Prentout, H., L'Ile de France sous Decaen (Paris, 1901)

شێوەیە لە ساڵی (١٧٧٨) دا روویداوە. ئەو دەمە پاپۆڕێکی ئینگلیزی بە بارێکی (٥٠٠) باڵەیی جلوبەرگەوە لە شاری (سورات) ەوە هاتبوو، راوەدوونرا و بەناچاری پەنای بردە بەر کەنارەکانی مەسقەت و هەر ئەوێشی بەدەستەوە مابوو. دیسان والی بەم فەرامۆشییە گەورەیەی دەزگا دادوەرییەکانی لای خۆی زۆر تووڕە بوو، کەوتە تەقەکردن لە کەشتییە فڕەنسییەکان و ناچاری کردن ئاوەکانی والی بەجێبهێڵن.[٦٧]

نابێ ئەو راستییەی، کە بەرپرسیارانی عووممان لە هەموو ئەم کێشانەدا لەدژی فڕەنسییەکان پشتگیریی ئینگلیزەکانیان کردووە، بەرەو ئەو ئاکامەمان ببات، کە بڵێین ئەو بەرپرسیارانە بەشێوەیەکی جێگیر دۆستی لایەنێك و نەیاری لایەنێکی تر بوون.[٦٨] لەکاتێکدا، کە برێك (پێوەرێك) لە راستی لەم ئاکامەدا هەیە، کە پێی گەشتین، دەتوانین باشترین روونکردنەوە بۆ ئەم هەڵسوکەوتەی والیی مەسقەت لەناو نەریتێکی زۆر باوی عەرەبدا بدۆزینەوە، کە پێی دەوترێ (دەخیل) و ئەوەش ئەوەیە، کە بە هەر نرخێك بێت، دەبێ خواستی پەنابەریی ئەو کەسەی لە دەست مەینەتیی ستەمی دوژمنەکەی هەڵدێت، رێزی لێبگیرێ، تەنانەت ئەگەر بەڕوونییش خۆی داوای نەکردبێ. رەگەز و ئاینیش بەگشتی نابنە رێگری بەردەم ئەنجامدانی ئەم چاکەیە. ئەو کاتەی بازرگانە ئینگلیزەکان لەلایەن دوژمنانیانەوە راوەدوونران و چوونە ناو بەندەری مەسقەتەوە بەڕوونی لە نەریتی عەرەبی پاڕانەوە بیانپارێزن،، ئەو نەریتەیش بەشێوەیەکی رەمەکی بەلای خێڵە عەرەبییەکانەوە هێزێکی باشی هەیە.[٦٩] بێگومان لە بەرامبەری ئەم خزمەتگوزارییە گەورەیەشدا هیچ پارەیەك لە ئینگلیزەکان وەرنەگیرا.

وەك ئەوەی ئەم ململانە فرانکۆ- عووممانییانە لە سەرەتاوە وەك ئەنجامی سیاسەتی نەیاریکردنی یەکتری نەهاتبوونە ئاراوە، فڕەنسییەکانیش هەمیشە بەو خەونەوە ژیاون، کە لەناو بازاڕی مەسقەتدا جێگەی ئینگلیزەکان بگرنەوە. هەمیشە بە خەڵات بەخشین و پۆزشهێنانەوەیان ویستویانە برێك لەو تووڕەییانەی ئیمام لەبەرامبەر کارەکانیاندا کەم بکەنەوە. لە دەوروبەری ساڵی (١٧٦٠) دا پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوانی

---

[67] Miles, op. cit., II, 268-270, 274-275.

[68] چەندان داوای یەك لەدوای یەکی ئینگلیزەکان، هەر وەکو داوای فڕەنسییەکان بۆ دامەزراندنی کارگەیەك لەلایەن ئیمامەوە ڕەتکراوەتەوە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوولاپەڕە ٢٨٢، هەروەها :
Wilson, op. cit. , 189.

[69] لەو دەمەوە کە عەرەب ژیانی شارنشینییان هەڵبژاردووە ئەم نەریتەش کز بووە. بەڵام لەناو زۆرینەی خێڵە عەرەبەکاندا زۆر بەهێز ماوەتەوە و لەناو دانیشتوانی شارەکاندا بوونێکی نییە.

مۆریشیۆس و مەسقەت دەستی پێکرد و چالاکانە تا نزیکی کۆتایی سەدەکە بەردەوام بوو. دورگەی مۆریشیۆس شەکری هەناردەی دەرەوە دەکرد و زەیتی رۆن ماسی و خورما و قاوەی هاوردە دەکرد.

لە ساڵی (١٧٨١) دا قەیرانی راستەقینەی فرانکۆ – عووممانی دەرکەوت. لەو ساڵەدا بە کردەوە چوارەمین پەلاماری سەر کەشتییە بازرگانییەکانی ئینگلیز لەناو بەندەری مەسقەتدا لەلایەن والییەوە پووچەڵکرایەوە. پاش ئەوەی بەم سەرنەکەوتنەشیان زۆر تووڕەبوون سێ کەشتییە پڕچەککراوە فڕەنسییەکە بەرەو بەشی سەرەوەی کەنداوی فارس کەوتنە جووڵە. لە رێگەدا چاویان بە (سالح) کەوت و دەستگیریان کرد، (سالح) یەکێك لە کەشتیی (فورقاتە)ەکانی ئیمام خۆی بوو. ئیمامیش یەکسەر دوونامەی ئیدانەکردنی ئەم کارەی نووسی، یەکێکیان بۆ بەرپرسیارانی مۆریشیۆس و ئەوی تریشیان بۆ حکومەتی فڕەنسی. لەوەش زیاتر هەستا بە دەست بەسەرداگرتنی یەکێك لە سێ کەشتییە جەنگییەکە. حکومەتی فڕەنسی لە پاریسەوە مەسەلەکەیان بە سەلیقەوە وەرگرت و مامەڵەیان لە تەکدا کرد. هاتن نیگەرانیی خۆیانیان لەبارەی رووداوەکەوە دەربڕی و کەشتییەکیشیان لەبریی سالح نارد بۆ ئیمام، ناوی (کۆرێ دێ لا فرێنس) بوو.[٧٠] لەمەشەوە پەیوەندیی دۆستانە دەستی پێکردەوە، ئەگەرچی (کۆرێ) لەرێگاکەیدا بەرەو عووممان لەلایەن چەتەکانی ئینگلیزەوە دەستی بەسەرداگیرا. بەلام لە ساڵی (١٧٩٠) دا فڕەنسییەکان کەشتییەکی تریان بۆ نارد و ئەمەیان گەیشتە دەست ئیمام.

شەڕی حەوت ساڵە بە ئاماژەکانی بالادەستیی هێزی ئاویی بریتانیاشەوە لەو شەڕەدا فڕەنسییەکانی ناچارکرد ئارەزووی ئەوە بکەن جارێکی تر بەدوای رێگایەکی وشکانیدا بگەڕێن لە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە بەرەو هیندستان. بۆیە لەوەوە دەستیان پێکرد، کە لێکۆڵینەوە لە گریمانەکانی گونجانی (کەناڵی سویس) بۆ ئەو مەبەستە بکەنەوە. بۆیە بە بەرهەمترین و خێراترین هەل لە دوا چارەکەی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دەرکەوت و بریتی بوو لەوەی هەریەکەی میسر و سعودیە بهێننە ژێر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیانەوە و هاوپەیمانێتییەکیش لەگەڵ ئێراندا دروست بکەن.

---

[70] Miles, op. cit., 277-278.

سـالآنی (١٧٩٠) ەكـان گەشـەیەكی جـێگیری چـالاكییەكانی فرەنـسایان بەخۆیانەوەبینی، نەك هەر لە عوومماندا، بەڵكو لە تەواوی رۆژهەلاتی ناوین و رۆژهـەلآتی نزیك و چەند بەشێكی دیاریكراوی هیندیشدا.

لەبەرامبەری ئەمەدا و بە دیوێكی دیكەدا كاریگەریی ئینگلیزیش لاواز بوو.

ئـەم دوو ئاراسـتە پێـچەوانەیە لـە سـالّی (١٧٩٣) دا بـووە هانـدەرێكی تایبـەت بـۆ سەرهەڵدانی ناكۆكی و دژایەتی لە نێوانی بریتانیا و فرەنسای شۆڕشگێڕدا. پەلامارەكانی فرەنسا بۆسەر پاپۆڕ و كەشتییەكانی ئینگلیـز لـەناو دەریالووشـی هیندیدا چڕبوونەوە. پـەلامارەكانی فرەنـسا دەستبەسـەرداگرتنی بڕێكـی ئـەو تالآنیانـەی رژێنرابوونـە نـاو بازاڕەكـانی عوومانـەوە و هەندێكیـشیان لـە كـەلكوتا گـیران و هـەر لـە هـەمان ئـەو بازاڕانەشدا، كە تیایاندا گیران دانرانەوە بۆ فرۆشتن.[71]

خەسڵەتی تایبەتمەندبوونی دەیەی نەوەدەكانی سەدەی هەژدە لەوەدا نییە، كە هـەر زوو ئەم پەلامارانەی ئەم كەشـتییە جەنگییانـە دەسـتیان پێكـردووە، بـەڵكو لـەوە پـتر، لەوەدایە، كە پێیدەگوترێ سەرهەڵدانی (ئەركە فرەنسییەكان– ئەرك بە مانـای مـەهام– و–). هاولآتیانی فرەنسی لە چەند ناوچـەیەكی رۆژئـاوای ئاسـیا دەركـەوتن و هـەموویان مەبەسـتی زانـستی یـان سیاسـییان هـەبوو، هەریەكەشـیان بەشـێوەیەك لـە شـێوەكان سـەودابیەكیان بـۆ خزمـەتكردن بـە پرسـی نەتـەوەیی خۆیـان هـەبووە. ئەمانـە زۆرجـار ئینگلیزیان بێزاركردووە، هیچ نەبێ لە كایە سیاسی– ئابورییەكاندا، بەلآم هیچیشیان لەو بێزاركردنە بەدەست نەهێنا.

یەكێك لە بەرچاوترینی ئەم ئەركانە ئەوەیان بـوو، كـە لەلایـەن حكومەتـەوە كۆمـەكی پێكرابـــوو، لـــەنێوانی ســـالآنی (١٧٩٣–١٧٩٨) دا روویـــدا و لەلایـــەن دوو زانـــای سروشتناسـەوە بـەڕێوەبرا، كـە بریتـی بـوون لـە (بروجێـر و ئـۆلیڤێر) دانیـشتوانە ئینگلیزەكانی ئەم سەردەمەی بووشـەهر و بەسـرە ،بـە دوودڵییـەوە وا دەزانـن ئامـانجی هـاتنی ئـەو سروشتناسـانە ئـەوەبووە لـە بەغـداوە و بـەناو ئێرانـدا رێگایـەك بـەرەو هیندستان بكەنەوە.[72]

---

[71] لەسالآنی فەرمانڕەوایی سولّتاندا لە (١٧٩٣–١٨٠٤) بڕی ئەو زیانانەی لەناو دەریالووشی هیندیدا لە بازرگانیی بریتانی كەوتن لە سێ ملیۆن ستەرلینی كەمتر نەبوون. – مایلز، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دوو، لاپەڕە ٣٠٢.

[72] Wilson, op. cit., 190.

بۆ بینینـی ڕاگەیانـدنێكی كـورت لـەبارەی ئـەم ئەركـەوە بڕوانـە سەرچـاوەكەی پێشوو، لاپـەڕەكانی ١٨٩–١٩٠

هەروەها بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:

◄◄

لە ڕاستیدا ئەو دوو کەسە سەرکێشە فرەنسییە لەساڵی (١٧٩٦) دا سەردانی تورکیا و میسریان کردبوو، پاشانیش ڕێگای (حەڵەب– بەغدا) یان گرتبووە بەر بەرەو تاران و تارانیش دووایین خاڵی گەیشتەکەیان بوو. بە ووتەی خوودی (ئۆلیڤێر) "ئەو ئەرکەی بۆ ناو ئێران پێیان سپێردرابوو، ئەوپەڕی گرنگ بوو".[٧٢]

لەبەرئەوەی لەلایەن حکومەتەوە کۆمەکی پێکرابوو، سەرباری ئەوەشی، کە ئۆلیڤێر جەخت لەوە دەکاتەوە گرنگ بووە، بریتانیاش وا لێی تێدەگات، کە مەترسیدار بووە، ئەو ئەرکە لە دەرەوەی کایەی زانستەوە ئەنجام دراوە و هیچ ئەرکێکی زانستیی گرنگی بەپەلەی وا لە ئارادانەبووە. لە یەکەمین شوێنیاندا و پێمِوایە لە ئەرکەکانی تریشیاندا بوونی هیچ پلانێك لە ئەرکەکانیاندا دەرنەکەوتووە. تەنانەت گەیشتەکەشیان بۆ ئێران هەر شتێك بووە، لەدەرەوەی بیرلێکردنەوە. ئەنجامی پووختی سەردانەکەیان بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی بۆ ئەوە بووە میانکارییەك لەلای ئەو ئیمپراتۆریایە بکەن، بۆئەوەی فرەنسا بتوانێت میسر داگیربکات، چونکە لەو دەمەدا بۆناپارت تازە کەوتبووە بیرکردنەوە لە میسر.

لە ئێران مەبەستەکەیان بریتی بوو لە هەوڵی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی ئەو کارگانەی وازیان لێهێنرابوو، لەگەڵ بوونیادنانی چەند کارگەیەکی نوێی تر و چەند ئاسانکارییەك، بەڵام هەوڵەکەیان شکستی خوارد. هەروەها لەو هەوڵەشدا سەرکەوتنێکیان بەدەست نەهێنا، کە دەیانویست ئێران قەناعەت پێبکەن، کە بە هاوبەرەیی لەگەڵ تورکیادا لەدژی رووسیا هەستنەوە.[٧٤]

لەکاتێکدا ئەم ئەرکانە ئارامیی ئینگلیزیان دەشێواند و ئەو ڕێوشوێنە سەختانەشی لە دەریاوە لەدژیان گیرابوونە بەر بووبوونە مایەی نیگەرانییان. لەو دەمەدا ناپلیۆن بۆناپارت لێدانێکی توندی ئاراستەی میسر و سوریا کرد و ئەمەش دەیەیەکی پڕ لە ململانەی ئەنگلۆ–فرەنسیی هێنایە ئاراوە و سەرەتای سەردەمێکی پڕ لە ململانەی نێوانی ئینگلیز و فرەنسای لەناو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بەرپاکرد. سەردەمی ناپلیۆن لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا سەردەمێکی ناوازەی زۆر دیارە لە ناوچەی ڕۆژهەلاتدا، نەك هەر

---

Watson, R. A., A History of Persia, from the beginning of the nineteenth century to the year 1858 (London, 1866), 99-100.

[73] Olivier, G. A., Travels in the Ottoman Empire, Egypt and Persia, "Translated From French" (London, 1801), I, P. XXIX

[74] Wilson, op. cit., 189-190; Aitchison, C. U., Collection of Treaties, Engagements and Sanads relating to India and Neighboring Countries (revised., Calcutta, 1909) , XII, 7.

تەنها لەبەر روداوەکانی ناوی، بەڵکو بەهۆی ئەو ئەنجامانەشەوە، کە لێیکەوتنەوە. کاردانەوەی خێرای ئینگلیز لەبەرامبەر ئەم مەترسییە نوێیەدا، ئەوەش هەوڵێکی چەشەکاریی پێکهێنانی بالادەستییەکی بریتانی بوو لەناو رۆژهەلاتی ناوەراستدا لە کۆتایی سەدەی هەژدەوە تا ئەمرۆ. دیارە بەراستی ئەمەش سەرەتای کاریگەرییەکە نەبوو، بەڵکو سەرەتای تەواوی ئەو کاریگەرییە لە دەیەیەکی پاش ئەوەوە دەستی پێکرد.

## ٢-یەکەمین سەرکەوتنی بریتانیا لەبەرامبەر نا پلیۆندا (١٧٩٨-١٨٠١)

هەرچەند بۆناپارت پێیبکرێ خۆی لە مەترسییەکانی دەریا لادەدات، لەبەرئەوەی دەریا بەشێك نییە لە کارەکەی ئەودا، بەلام بە پشتبەستن و متمانەکردن بە تواناکانی خۆی و هەلپەی شوێنکەوتووەکانی هەولّی پێکانی مەبەستەکەی خۆی دەدات، کە بریتییە لەوەی بە سەرمەشقکردنی نمونەی کارەکەی ئەلێکزاندەر بە حەلەبدا بروات و لە فوراتەوە بپەرێتەوە و پاشان ملی رێگای دیجلە و فورات بگرێت و بەرەو کەنداوی فارس شۆرببێتەوە و لەوێشەوە بەدرێژایی کەنارەکەدا تا ئیندیز پەل بکوتێت[75].

بۆچوونێکی سەرنجراکێش هەیە لەم بەلگەنامەیەدا دووپاتکراوەتەوە، مانای ئەم بۆچوونەش ئەوەیە، کە بۆناپارت لە بەرنامەیدا بووە هیندستان داگیربکات و لەوێشەوە لە رێگای رۆژهەلاتی نزیك و ناوەراستەوە ملی رێگە بگرێتەبەر بەرەو گەیشتن بە ئامانجەکەی خۆی. دیارە ئەو بەلگەیە راڤەکردنێکی سادەکراوەی کەسێکی بریتانیی دیار و بەرچاو بوو، کە لەبارەی مەترسییەکانی ناپلیۆنەوە بۆسەر ئیمپراتۆریا رۆژهەلاتییەکەی خۆیان زەنگی مەترسیی لێدابوو. سەرباری ئەوەش، کە مەترسییەکە گەیشتبووە ئاستێکی بالا، گومانی ئەوەش پەیدابووبوو، کە ئەو دوژمنکارییەی فرەنسا گەیشتبووە دوا ئاکامی رەشی خۆی.

کاربەدەستە بریتانییەکانی ناو هیند ترسێکی تایبەتییان لێنیشتبوو. "ئێمە هەست بە مەترسییەکی قووڵ دەکەین لەبارەی مەترسیی فرەنساوە بۆسەر هیندستان. هەمیشە ئەو ئیمپراتۆریایەی ئێمە لە رۆژهەلات لەلایەن فرەنساوە چاوی تێبردراوە، هەروەها دەشزانین کە حکومەتی پێشوویان ئومێدی سووری ئەوەی هەبوو بتوانێت بە سوورانەوەیەکی کورتتر لە رێگەی سەری ئومێدی باشەوە بگاتە هیندستان، هەروەها

---

[75]Henry Dundas, Secretary of War, to Lord Grenville, 13. 6.1798. (Autograph letter.) Quoted in Wilson, op. cit., In.

گومانێکمـان لـەوەش نییـە، کـە ئـەم حکومەتـەی ئێستەشیان سەرکێشی بـە پـلان و پرۆژەیەکی گەورەوە دەکات و پێوەری سەرسووڕهێنەر و نائاساییش لەبەرچاو دەگرێ بـە ئومێدی ئـەوەی دەسـەڵات و کاریگـەریی بریتانیـا لـەم گۆشـەیەی جیهانـدا، ئەگـەر قەڵاچۆیش نەکات، کەمی بکاتەوە". [٧٦]

هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم نیگەرانییە گەورەیە داگیرکردنی میسر بوو لەلایـەن ناپلیۆن بۆناپارتەوە. لەپاش چەند و چوونکردنێکی درێژخایەن ئەوەبوو دواجار لە مانگی ئاداری ساڵی (١٧٩٨) دا حکومـەتی فەرەنسی بڕیـاری داگیرکردنـی میسری دا. ئیـدی سوپای فەرەنـسا بـەرەو (ماڵتـە) کەوتـە جووڵـە و لــە ١٩/ حوزەیرانـدا لەوێـشەوە بـەرەو ئەسکەندەرییە کەوتـە جووڵـە و لـە ١/ تـەمموزدا لـە ئەسکەندەرییە لەنگـەری گـرت. [٧٧] لەوێوە ئیتر ، کە زانییان بۆناپـارت بـەرەو میـسر بەڕێوەیـە وەزیـری جـەنگی بریتـانی و فـەرمانڕەوا بریتانییـەکانی هینـد کەوتنـە لێـدانی زەنگـی مەترسـی ، هێـشتا نـاپلیۆن بەڕێگاوەبوو، ئەوان یەکەمین پـەیامی خۆیانیـان لـەم بارەیـەوە ڕاگەیانـد. داگیرکردنەکـە بەڕێوە دەچوو، نیگەرانیی بریتانییەکانیش لەبارەی موڵکە دوورەدەستەکانی خۆیـان لـە هیندسـتان گـەورەتر دەبـوو، ئەمـەش وایلێکـردن زنجـیرە ڕێوشـوێنێکی بـاش لەبەرچـاو بگرن. بە کاری ڕێکەوت ئەو نیگەرانییەیان دڵەڕاوکەیەکی سـەرنجڕاکیش بـوو. قورسـی و درێژخایـەنیی پەیوەنـدیکردن لـە ڕێگـای ووشـکانییەوە، هەڕەشـەی خـەڵکانی عەشایەر بەدرێژایی ڕێگاکان، مەترسیی پەتا و نەخۆشی، کـەمیی کەرەسـتەو پێداویـستی، هـەموو ئەمانە پێکەوە لەمپەری ڕێگر و پەکخەر بوون بۆ بە واقعی بوونی هەر هەڵپەیەك لەلایـەن بۆناپارتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە ڕێگـای زەمینییـەوە و لـە میـسرەوە ڕێگـای شـەڕێك بـەرەو هیندستان بگرێتەبەر. . لەگەڵ ئێران و هەروەها لەگەڵ عوومانیـشدا، کـە سـەرەکیترین دەوڵـەتی عـەرەبیی نـاو کەنـداوی فـارس بـوو، کۆمەڵـە ڕێکەوتننامەیـەکی چـالاکانەیان هێنایەپێـشەوە و لــەبارەی میـسۆپۆتامیاشەوە بــۆ یەکــەمین جــار گرنگییــەکی دیپلۆماسییانەی جدییانەیان پێدا.

سـەرباری ئـەوەش کاردانـەوەی بریتانیـا بـەپێی مەترسییە گـەورەکانی خۆیـان بـوو. توانییـان ئاسـتانە بـەلای خۆیانـدا ڕابکێـشن، بـۆ ئـەوەی بەمـە بەشـی ڕۆژئـاوای ڕێگـای

---

[76] "Extract of letter from the Secret Committee of the court of Directors, to the governor-General in Council of Bengal, dated 18th June, 1798. " Owen, S. J. (ed.), A Selection from Wellesley's Dispatches (Oxford, 1877), 2. Copies of this dispatch were transmitted to the Governors of Madras and Bombay.
[77] Cambridge Modern History, VIII, 594-596, 598, 599.

وشـــكانیی بـەرەو هیندســتان بپـارێزن. لـەناو هیندســتان خۆیـشیدا بـۆ بـەهێزکردنی پلەوپایەی خۆیان سیاسەتێکی چالاکانەیان گرتەبەر.

کاروباری مامەڵە کردن لەگەڵ سوڵتانی ئیستەنبوڵدا درایە دەست حکومەتی نـاوخۆیی و مامەڵــەکردن لەگــەڵ رۆژهــەلاتی ناوەڕاستیــشدا ســپێردرایە دەســت حکومەتەکــەی هیندستان. رێکەوتننامەیەکی هاوپــەیمانێتی لەگەڵ تورکیـادا دەست پێکرا و لـە رۆژی (٥/کـانوونی دووەم/١٧٩٩) دا لــە ئیــستەنبوڵ ئیمــزا کــرا. ئــەم رێکەوتننامەیــە لــە دیباجەیـەکی سـیانزە بەنـدی پێکهـاتبوو. دیباجەکـە ئامـاژە بـەوە دەکـات، کـە ئـەو رێکەوتننامەیە وەك کاردانەوەیەك بە (خیانەت و دەستدرێژییە بێشومارەکانی فرەنسا) پێکهێنـراوە. بـەپێی بەنـدی یەکـەم، ئامـانج لـەو هاوپەیمانێتییـە هـەمان ئامـانجی ئـەو هاوپەیمانێتییەیە، کە لـە نێـوانی بریتانیـا و رووسـیادا ئیمـزا کـراوە. بـەڕوونی بـۆ ئـەوە سازکراوە هاوپەیمانێتییەکی سێ لایەنەی لەگەڵ بریتانیـادا پـێ تـەواو بکـرێ و بریتانیـا سەری گرێ داوە کـە بێـت. بریتانیـای مـەزن و تورکیـا بەهاوبەشـی لـە بەنـدی دووەمـدا موڵکـەکانی خۆیانیـان دەستنیـشان کـردووە "موڵکـەکانیان لـەپێش داگیرکردنـی میـسر لەلایەن فرەنساوە چۆن بووە، بەو شێوەیە دایاننـاونەتـەوە." ئـەم دابینبوونەشیان وەك رووح و بابەتی سەرەکیی هاوپەیمانێتییەکەیان لەقەڵەم دەدرێ.[٧٨]

ساڵی (١٧٩٩) بۆ بریتانیا چەند ساڵێکی یەکلاییکەرەوە بوو، بۆ سـوڵتانیش شـتێکی لەوە کەمتر نەبوو، چونکە موڵکەکانی ئەمانیش راستەوخۆ کەوتبوونە بـەر پـەلامارەکانی بۆناپارت. سوڵتان هات شەڕی لـە دژی فرەنـسا راگەیانـد، لەبەرئـەوەی ئـەوان میـسریان داگیرکردبوو، میسریش بەشێکی دیار و بەرچاوی ناو موڵکەکانی ئیمپراتۆریای عوسمـانی بوو. وەڵام و کاردانەوەی بۆناپـارتیش ئـەوەبوو لـە بـەهاری سـاڵی (١٧٩٩) دا پـەلاماری سوریاشی دا، کە ئەوێیش ناوچەیەکی سەر بە ئیمپراتۆریـای عوسمـانی بـوو، بـۆ ئـەوەی لەوێشەوە بتوانێت پەلاماری ئیستەنبوڵیش بدات. بەڵام ئەم هێرشـەیان سـەرنەکەوتنێکی تراژیدییانە بوو. لە پایزدا کەنارە ئاوییەکانی میسر و سـوریا بـە کـردەوە لەلایـەن هێـزی دەریایی بریتانییەوە گەمارۆ دران و بەمەش رێگای ئەو کۆمەکە سـەربازیانە بەسـترا، کـە

---

[78] بۆ بینینی دەقی رێکەوتننامەکە بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Parliamentary History, XXXVI, 309-312; Parliamentary Debate, 1808, X, 497ff. In British and Foreign State papers, Vol. I, pt. I, 768-773,
بەداخەوە دیباجەی پەیماننامەکە بە تەواوی شێوێنراوە، چونکە هەر ئاماژەیەکی خراپی تێدابوبێ بۆ فرەنسییەکان تێدانەهێڵراوەتەوە و لابراوە

لە فرەنساوە بۆ سوپا فرەنسییەکە دەهاتن. ئیدی بۆناپارت خۆی و دەستەیەك لە باشترین ئەفسەرەکانی بەرێگایەکی نهێنی لەمیسرەوە هەڵاتن و لە رۆژی ٩/ ئۆکتۆبەردا گەیشتنەوە فرەنسا. ئەگەرچی سوپایەکی بەهێزی فرەنسی هێشتا لە میسردا مابوونەوە، پێویستیی پێکەوە هاریکاریکردنی ئەنگلۆ- عوسمانی بەتەواوی لەویَ نەخەملیبوو. رووداوە گەورەکەی ناو میسر لە ساڵی (١٨٠١) دا گەیشتە ئاکامێکی سەرکەوتوو. لەو ساڵەدا ئەوەبوو هێزێکی بریتانیی بەتوانا لە هیندەوە بەناو دەریای سوردا هات و میسری داگیرکرد و فرەنسییەکانیشی بە تەواوی تاراندە دەرەوە.

وەك بەرهەم و پاداشتێکی ئەوەی لە دژی فرەنسییەکان، بریتانییەکان بەرەڤانییەکی سەرکەوتوویان لە میسر و سوریا کردبوو لە رۆژی (١٠/تشرینی یەکەم/١٧٩٩) دا "بە فەرمانی ئاستانەی شکۆدار رێگە بە کەشتییە بازرگانییەکانی بریتانیا درا ئیمتیازی بازرگانیکردن لەناو دەریای رەشدا وەربگرن." ئەم هەلەش بەباشی بۆ ئەوە قۆزرایەوە سەرلەنویَ جەختی لەسەر هاوپەیمانێتی و ئاڵوگۆڕی نێوانی ئەو دوو دەوڵەتە پێبکرێتەوە. زۆرترین بەشی بەڵگەنامەکەی نێوانیان بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەم مەبەستە تەرخان کرابوو. وا ئاماژە بەو یارمەتییەی بریتانیا کرا، کە ئەوە پشتگیریکردنێك بووە لە جیهانەکەی سوڵتان و لەمەوە بەڵێنی جدی درا، کە لە ئایندەدا یارمەتیی یەکتر ئاڵوگۆڕ بکەن. ئەو دەمە هێشتا هیچ پێشینەیەکی یەکەم سیمای غەزووکردنی هیند لەلایەن ناپلیۆنەوە دەرنەکەوتبوو، سوڵتانیش وا دانرابوو، ئەو هاوپەیمانەیە کە ناکریَ دەستی لێهەڵبگیریَ.

> ئەو هاورێیەتی و رێکەوتنەی، کە لە سەردەمانێکی زووەوە لەنێوانی ئاستانەی باڵادەست و خاوەن شکۆی هەمیشەیی و کۆشکی پادشایی بریتانیادا هەیە، ئێستا بە خۆشحاڵییەوە لەسەر بناغەی بەهێزی راستی و دڵسۆزی بووە بە هاوپەیمانێتی. سەرباری ئەو سوودە زۆرانەی کە هەردوو وڵاتەکە لەم پەیوەستە نوێیانە لەنێوانی هەردوو کۆشکی پادشاییدا چنیویانەتەوە، خوا یاربێت لە ئایندەشدا کاریگەریی باشی دەبێ.[79]

[79] British and Foreign Papers, vol. I, pt. 1,766

دیپلۆماسیێتی و سوپای بریتانی له ڕۆژهەڵاتی نزیکدا زۆر سەرکەوتوو بوون و سەرکەوتنەکەشیان لە هیندستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەوە کەمتر نەبوو. بەهاری ساڵی (١٧٩٩) لە هیندستانیشدا هەروەك لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بەهارێکی یەکلاییکەرەوە بوو، ئەگەرچی سەرکەوتنەکان بە دیپلۆماسیێتی بەهێز و هێزی سەربازیی کارامەوە نەبووایە بەدەستنەدەهاتن. ئەوە وێلزلی خانەدان (لۆرد ریچەرد کۆلی وێلزلی) فەرمانڕەوا گشتییە بەتواناکەی هیندستان(١٧٩٨–١٨٠٥) بوو، کە جڵەوی شتەکانی بەدەستەوە گرتبوو. لە ڕێگایدا بۆ دانیشتن لەسەر کورسیی حکومەتی باڵای کەلکەتا، ڕۆژی (٢٦/نیسان/١٧٩٨) کە گەیشتە شاری مەدراس، هەر یەکسەر خۆیی تەرخان کرد بۆ نەهێشتن و لادانی دوو سەرچاوە سەرەکییەکەی مەترسیی سەر دەسەڵاتە زۆر باڵاکەی بریتانیا لە هیندستان، کە بریتی بوون لە (تیپوو سوڵتان–ی شاری میسۆر– کە شارێکی باشووری هیندستانە–و–)لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا، کە بریتی بوون لە فرەنسییەکان و کاریگەریی ئەم فرەنسییانە تەنانەت کەوتبووە سەر (نیزامی حەیدەرئاباد)، کە هاوپەیمانێکی پێشووی بریتانیا بووە.

ئەم (تیپوو)ە دوژمنێکی سەرسەختی بریتانییەکان بوو. شەڕێکیشی لەدژیان بەرپاکرد و سەرکەوتوو نەبوو. ئیتر کەوتبووە خۆسازدان بۆ هێرشێکی گەورە. بێگومان (تیپووی هاوڵاتی) حسابی خۆیی لەسەر ئەوە کردبوو فرەنسییەکان یارمەتیی بدەن، بەتایبەتییش لە مەشقپێکردنی سەربازە خۆماڵییەکانی و پڕچەککردنی سوپاکەیدا. ئەو هێزە فرەنسییانەی لەگەڵیاندا بوون، ئەگەرچی بە ژمارەش کەم بوون، بەڵام کاریگەرییەکەیان زۆربوو، لەگەڵ خەڵکە بەسەربازگیراوەکاندا دەگەڕان ڕەنگی شۆڕشگێڕانەیان پێوەبوو، هێمای ئازادی بەسەر قۆپچەکانیانەوە نەخشێنرابوو.[80] هەر کە لۆرد وێلزلی گەیشتە ناو خاکی مەدراس (ڕایمۆند) ی سەرکردەی چالاکی ئەم هێزانە مرد. ئەوەش ڕوداوێکی خۆش بوو بۆ فەرمانڕەوای گشتی، بەڵام نە هەلومەرجەکە بۆ ئەوە گونجاو بوو، تا ئەو خۆشییە هەست پێبکرێ و نە بارودۆخەکەش هێندە ئارام بوو.

---

[80] Kaye, J. W. The Life and correspondence of Major-General Sir John Malcolm (2 vols. , London, 1856), I, 67-68.

هەروەها بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی کۆی چالاکییەکان و دژایەتیکردنەکانی تیپووەوە لەدژی بریتانییەکان و هاوڕێیەتیی لەگەڵ فرەنسییەکاندا بڕوانە نامەکانی خۆی لە
Owen, op. cit., passim

لەپاش چەند مانگ لە خۆسازدانی ئاگایانە، کە سیستمێکی وردی تاوتوێکراوی هاوپەیمانی بەستنیشی تێدابوو لەگەڵ خەڵکە دەسەڵاتدارە ناوخۆییەکاندا، فەرماندەی گشتی هەستیکرد، ئیتر کاتی ئەوەهاتووە بکەوێتە جووڵە. فەرماندەی گشتی خزمەتێکی بە (تیپوو) کرد، ئەویش ئەوە بوو دوا ئاگادارکردنەوەی پێدا و پێی وت، کە چاری ئەو بریتییە لە خۆبەدەستەوەدانی تەواو. بەڵام ئەوەبوو داواکەی رەتکرایەوە، لەمەوە سوپاکان پرچەککران، (میسۆر) یش لەرۆژهەڵاتەوە و لەلایەن چەند هێزێکەوە، کە لە بۆمبایەوە هاتبوون پەلاماردرا، لەرۆژهەڵاتیشەوە لەلایەن دوو سوپای ترەوە، کە یەکێکیان لەژێر فەرمانڕەوایی (ئارسەر ویلزلی) ی براچوکی فەرمانڕەوای گشتیدا بوو، کە پاشتریش بەناوی (دۆقی ویلینگتن) ناسرا و ناوبانگی پەیداکرد. لە رۆژی (٤/مایس/١٧٩٩) دا (سێرینگاپاتام) ی پایتەختی میسۆر گیرا و تیپوو کوژرا و فرەنسییەکان بێ ئومێدانە گەڕانەوە و خێرا پەیوەندیی دۆستانەی خۆیانیان لەگەڵ (نیزامی حەیدەرئاباد) دا تازەکردەوە.[81]

لۆرد ویلزلی ئیتر دەستی بەتاڵ بوو بۆ مامەڵەکردنی چالاکانە لەگەڵ ئێران و عوومان، چونکە پێشتر لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەمانەدا هەولێکی ناسەرکەوتووانەی هەبوو. بە زوویی و پاش گەیشتنی بە هیندستان (میرزا مەهدی عەلی خان– کە پیاوێکی فارس بوو) ی وەك جێنشینی بریتانیا لە بوشەهر دیاریکرد و ئەوەشی پێسپاردبوو، کە چاودێریی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە عووممانیش بکات. لە رێگایدا بەرەو بوشەهر(ئەیلولی ١٧٩٨) میرزا مەهدی لایدایە مەسقەت و لە (١٢ / ئۆکتۆبەر) یشدا توانرا یەکەمین رێکەوتننامەی هاوپەیمانیی ئەنگلۆ–عوممانی ئیمزا بکرێ. ئیمام بەپێی ئەو پەیماننامەیە رازیبوو هاوڵاتییە فرەنسیەکان لە هەرێمەکانی خۆی و کەشتییە فرەنسییەکانیش لە بەندەرەکانی دەربکات. لەبەرئەوەی لەو دەمەدا هێشتا هەر شەڕی نێوانی ئینگلیز و فرەنسا بەردەوام بوو. بواری بە کۆمپانیای رۆژهەڵاتی هیندستانیش دا، کە بێن کارگەیەك لە بەندەر عەباس دروست بکەن_پاشانیش هەر لەژێر قەڵەمڕەوی فەرمان و دەسەڵاتی خۆیدا_ ٧٠٠ – ٨٠٠ پاسەوانی هیندییان بۆ هێنان. سەرباری ئەمانەش بەشێوەی زارەکی رەزامەندیی لەسەر ئەوە پیشاندا، کە نوێنەرێکی کۆمپانیاکە لە مەسقەت نیشتەجێ ببێت، بۆئەوەی لەبارەی ئەو شتانەوە، کە هەردوولا نیگەران دەکات، راوێژ لەگەڵ ئیمامدا بکات. بە گەڕانەوەش بۆلای کاروباری بازرگانی، ئیمتیاز و

---

[81] Roberts, P. E. , History of British India (Oxford, 1938), 241-246; Kaye, op. cit., 66-85

ئاسانكاریی ئەوە درایە بازرگانە عووممانییەكان، كە ئەمانیش بتوانن لە هەرێمەكانی سەر بە بریتانیادا بازرگانی بكەن. {بەمەش (سوڵتان) سەید سوڵتان ی ئیمامی مەسقەت(١٧٩٣-١٨٠٤)بوو بە یەكەمین میری ناو دوورگەی عەرەبی، كە پەیوەندییەكی سیاسییانە لەگەڵ بریتانیادا دروست بكات..}[٨٢]

مانگەكانی زستانی (١٧٩٨-١٧٩٩) كاتێكی لەبار نەبوون بۆ فەرمانڕەوای گشتی، بۆ ئەوەی بتوانێت ریزەكانی ئێران و عوومان لەدژی فرەنسا یەكبخات. لەگەڵ ئێراندا هیچ شتێكی وا بەدەست نەهات، كە شایانی باس بێت. ئەو رێكەوتنە بەراییەیش، كە لەگەڵ عوومماندا ئیمزا كرا بەهایەكی كەمی هەبوو. بۆ دڵنیاییش لە كەم بەهاییەكەی، ئەو رێكەوتننامەیە لە هەلومەرجێكی نالەباردا ئیمزا كرابوو. داگیركردنەكەی میسر لەلایەن بۆناپارتەوە تا دەهات قەببەتر دەبۆوە، ناوبانگی فرەنساش هەر بەرەو سەرەوە و بۆ ئاستی باڵاتر دەكشا. بەدیوێكی تریشدا فەرمانڕەوای گشتی هێشتا هەر دەبوو بە تەنگی ئەو مەترسییە گەورانەوە بێت، كە لەناو خوودی هینددا بۆی دروست دەبوون. ئیمامی عووممانیش، كە خۆی هەر مەیلێكی تایبەتی لەبەرامبەر بریتانییەكاندا نەبووە، گوێی بۆ فرەنسییەكان شل كردەوە و بازارەكانی خۆیانی كردەوە بەڕووی ئەو كاڵا بازرگانییە نرخ نزمانەی، بریتانییەكان كە دەستیان بەسەردا گیرابوو. هەروەها بۆناپارتیش ئیمامی بە هاوڕێیەكی باشتر لە تیپوو بۆ خۆی و بە دوژمنی تەواوی بریتانیاش دادەنا، وەك ئەوەی لەم نامانەدا هاتووە:

قاهیرە / ٢٥/ كانوونی دووەم/ ١٧٩٩

بۆ ئیمامی مەسقەت

ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم بۆ ئەوەی لە گەیشتنی سوپای فرەنسا بۆ میسر ئاگادارت بكەین. لەبەرئەوەی تۆ هەمیشە دۆستمان بوویت، پێویستە دڵنیات بكەین لەوەی ئارەزوومانە هەموو ئەو كەشتییە بازرگانییانە بپارێزین، كە تۆ بتەوێت بیاننێریتە سوێس. هەروەها تكای ئەوەشت لێدەكەم، لە یەكەمین هەلدا، كە بۆت رەخسا، ئەم نامەیەم كە لەناو ئەم نامەیەی خۆتدایە بگەیەنیت بە تیپوو ساحیب.

ئیمزا / بۆناپارت

---

[82] Miles, op. cit., Ii, 291.

قاهیره/ ٢٥/ کانوونی دووهم/١٧٩٩

بۆ تیپوو ساحیب

دیاره تۆ زانیاریت پێدراوه لەسەر ئەوەی، کە من بە سوپایەکی بێشومار و سەرسەختەوە گەیشتومەتە کەنارەکانی دەریای سوور. ئارەزوومە لەدەست ئاگر و ئاسنی ئینگلتەرە دەرتبهێنمە دەرەوە. تامەزرۆم و بەپەلەم لەبارەی ئەو پۆست و ئاستە سیاسییەوە، کە ئێستە خۆتی تێدا دەبینیتەوە زانیاریم دەست بکەوێت.

هەروەها حەز دەکەم کەسێك بنێریت بۆ سوەیس، کە کارامە و جێگە بڕوای خۆت بێت، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین راوێژێکی لەگەڵدا بکەین.

ئیمزا

بۆناپارت[83]

ئەم نامانە لەلایەن (کاپتن ویڵسن) ەوە دەستیان بەسەردا گیرا، کە کرێگرتەیەکی ئینگلیز بوو لە شاری (موکە– کە شارێکی بازرگانییە لەسەر کەنارە ئاوییەکانی یەمەن) و پاشان ناردنی بۆ هیندستان. بەڵام بەڕێکەوت تا رۆژی (٤/ئایار/١٧٩٩) نەگەشتنە دەستی لۆرد ویڵزلی، لەبەرئەوەی رێگاکانی پەیوەندی لەو دەمەدا خاو بەڕێوەدەچوون و دوورییەکی زۆریش لەنێوانی قاهیرە و هیندستاندا هەیە. بە دەربڕینێکی دیکە، نامەکان لە بەهارێکی درەنگدا گەیشتنە دەست فەرمانڕەوای گشتی و ئەو کاتەش ئەو تازە ئاماژەکانی سەرکەوتنی خۆیی بەسەر تیپوو و هاوپەیمانە فرەنسییەکانیدا بەدەست گەیشتبوو. لەبیرمان نەچێ لە کاتێکی درەنگی بەهاری ئەو ساڵە و سەرەتای هاوینیدا بریتانییەکان سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەیان بەسەر فرەنسییەکانی ناو سوریا و میسردا بەدەستهێنابوو. لەناوەڕاستی ساڵی (١٧٩٩) دا سومعەی بریتانیا لە رۆژهەڵاتدا رووی لە هەڵکشان کردبوو، لە بەرامبەریشدا ناوبانگی فرەنسییەکان رووی لە دابەزین بوو. ئەمەش هەلومەرجێکی خوازراو و لەباری هێنایەپێش بۆ ئەوەی لۆردی ویڵزلی گوشاری دەستپێکردنی دانووستاندن بخاتەسەر هەریەکە لە ئێران و عوممان. گەیشتنی دوونامەکەی بۆناپارت بە فەرمانڕەوای گشتی لەم کاتە گونجاوەدا بوو، دیاربوو کاریگەرییەکیشیان هەبوو لەسەر سووربوونی فەرمانڕەوای گشتی، ئەگەرچی پێویست

[83] لە سەرچاوەی پێشووەوە وەرگیراوە، لاپەڕە ٢٩٠.

نەبوو گرنگییەکی زۆر بدرێ بەو دوو کەسە، چونکە پەیوەندییەکانی ئیمام و تیپوو لەگەڵ فرەنسییەکاندا شتێك نەبوو، کە حکومەتەکەی هیندستان ئاگای لێی نەبێت.

نێردراویان بۆ ئێران بریتی بوو لە کاپتن (جۆن مالکۆلم- کە پاشتر بوو بە سێر جۆن مالکۆلم) و ئەرکەکەشی وەك خۆی باسی لێکردووە بریتی بووە لەوەی (ڕێگری لەگریمانی هەر هەوڵێکی ئەو فرەنسییە خراپەکار، بەڵام چالاك و دیموکراتانە بکات) بۆئەوە راسپێردرابوو، کە ئەگەر هەر پێشێلکارییەك بەرامبەر بە هیندی بریتانی روویدات، ئەوە مسۆگەر بکەن، کە ئێران لە دژی (زەمان پاشای ئەفغانستان) پشتگیری بریتانییەکان بکات و هەروەها هانی بازرگانییەکی ئەنگلۆ-فارسییش بدات و ئەو بازرگانییەش بخاتەوەگەڕ. ئەمانە سێ دۆسییەی ئەرکەکەی مالکۆلم بوون لە ئێران.[84]

لەبارەی عوومانیشەوە دەبوو پەیماننامەکەی ساڵی (١٧٩٨) نوێ بکاتەوە و چاوبخاتە سەر ئەوەش، کە کاریگەرییەکانی فرەنسا بەباشی لەو ناوچە ستراتیجییە بنەبڕ بکرێ.

لەسەر ڕێگاکەیدا بەرەو ئێران مالکۆلم لە مەسقەت راوەستا، بۆ ئەوەی بتوانێت پێش ئەوەی ئەرکەکەی دەست پێبکات، لە گرفتەکەی ئەوێ تێبگات. بۆ موجامەلە چەندان هاتوچۆ و سەردانی پارێزگاری شارەکەی کرد، هەر لەگەڵ رۆشتنی ئیمامدا، کە لەو دەمەدا وەك بەشداریکردن لە شاندێکی نێردراودا دەچووە شوێنێکی کەنداوی فارس، ئەمیش راستەوخۆ ملی دەریای گرت. لە رۆژی (١٨/کانوونی دووەمی/١٨٠٠) دا لە دورگەی (حەنجام) سەرکەوتە سەر کەشتییەکەی ئیمام. ئەم نێردراوە بریتانییە زۆر کارامانە کاری لەسەر هیوا و ترسەکانی ئیمام کرد و مەسەلەیەکی باشی لەسەر سەرنەکەوتنەکەی بۆناپارت لە میسردا دروستکرد. ووتی : فرەنسییەکان"ئەو نەتەوە بێ یاسایە هەموو پەیماننامەکانیان پێشێل کردووە و پەلاماری میسریان داوە، خۆیانیان کردووە بە پێشەنگی سەر ڕێگاکانی شارە پیرۆزەکانی مەکە و مەدینە، بێگومان خوا خۆیی نانیان دەبڕێ و ئەوە خواستی خوا بووە، بەو بەزەییەوە نەیویستووە بریتانییەکان لەو گۆشەیەدا خۆیان ماندوو بکەن. ئەوەتا فرەنسییەکانی بەو بەزینە گەیاند و دەبینی پاشماوەی سوپاکەیان لە خەمی ئەوەدان چۆن بە سەلامەتی لە میسر دەربچن."[85] مالکۆلم لە بەرامبەر ئەمەشدا ئاماژە بەوە دەدات کە بریتانیا

---

[84] Kaye, op. cit., I, 89-90.

[85] لە سەرچاوەی پێشووەوە وەرگیراوە، لاپەڕە ١٠٧ .

بەپێچەوانەی ئەوانەوە سەرکەوتنی باشی بەسەر تیپو و هاوپەیمانە فرەنسییەکانیدا بەدەستهێناوە. هەموو پەلامارەکانی بۆناپارتی بۆسەر میسر و سوریا پووچەڵ کردۆتەوە. هەروەها مالکۆلم ئاماژەیەکیشی دایە سەرکەوتنە کۆنەکانی خۆیان بەسەر هۆڵەندییەکانیشدا، کە ئەگەرچی کۆن بووە، بەڵام سەرکەوتنێکی جوان بووە. هەروەها وتووشیەتی، کە بەندەرە دەوڵەمەند و گرنگەکانی هیندستان کەوتوونەتە ژێر کۆنترۆڵی بریتانیاوە و ئەگەر هاوپەیمانێتییەکی راستەقینەی ئەنگلۆ- عوومانی دروست ببێ، ئەوا ئەو بەندەرانەش بۆ بازرگانە عوممانییەکان کراوە دەبێ. بەڵام بەدیوێکی تریشدا، ئەگەر ئیمام گرێدانی ئەو هاوپەیمانێتییەی بەلاوە باش نەبێت و بەردەوام بێت لە پەیوەندییە دۆستانەکانی خۆی لەگەڵ فرەنسییەکاندا، ئەوا بەرپرسانی بریتانیا بەپێی پێویست ناچار دەبن هەموو بەندەرە بریتانییەکان لە بازرگانە عوومانییەکان قەدەغە بکەن و عوومانیش وەك دەسەلاتێکی بێگانە سەیر بکەن.

ئیمامیش، کە بەباشی گوێی بۆ قسە کاکڵەدارەکانی مالکۆلم گرتبوو، تەواو بەئاگاش بوو لە گۆڕانی رەوتی روداوەکان. بۆیە دەبوو بەزوویی بڕیاری خۆی بدات، ئەوەبوو رێکەوتننامەکەی ساڵی (١٧٩٨) نوێژەن کرایەوە و بەندێکی ئەوەشیان خستەسەر ، کە دەبێ نوێنەرایەتییەکی سیاسیی بریتانیا لە مەسقەت بکرێتەوە. لەناو ئەو ستافەدا، کە لەگەڵ مالکۆلمدا چووبوونە ئەوێ یارمەتیدەرێکی تایبەتی خۆی هەبوو ناوی (سەرجیۆن بۆگڵ) بوو، بەتایبەتی بۆ ئەوە برابوو ئەو پۆستە نوێیە لە مەسقەتدا وەربگرێ. بۆگڵ هەر بەزوویی توانیی جێگەی ئەو دکتۆرە فرەنسییە بگرێتەوە، کە بەدەر لە کاری پزیشکییانەی خۆی راگر و چاودێریکاری بەرژەوەندییەکانی فرەنساش بوو لە مەسقەت. لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا (کای-١٨٥٦) دەڵێ : "لە رۆژهەلاتدا دوو دەروازەی گەورە بەرووی گۆڕەپانە گەورەکەی دیپلۆماسیەتی بریتانیادا کراونەتەوە. یەکیان بازرگانییە و ئەوی تریشیان پزیشکییە. لەراستیدا ئێمە لەم رووەوە قەرزاریاری ئیمپراتۆریاکەی خۆمانین"[86]

لەپاش ئارامگرتنی گرفتەکەی عوممان، مالکۆلم گەیشتەکەی بەرەو ئێران دەستپێکرد و لەوێش بارودۆخێکی ئالۆزی نائاسایی بینی. زوو ئەوەی بۆ ئاشکرابوو، کە

---

[86] سەرچاوەی پێشوو. بۆزانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم پرۆژە ئەنگلۆ-عوومانییەوە بروانە سەرچاوەکەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٠٥-١١٠. بۆچوونێکی کورتکراوە لە کتێبەکەی مایلزیشدا هەیە، هەمان سەرچاوە، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٢٩٢-٢٩٣.

سەرکەوتنەکەی دەوەستێتە سەر ئەوەی، کە بەشێوەیەکی تایبەت دیاری و خەڵاتی گرانبەها دابەش بکات و لە گوتار و دەستپێشخەریی قسەکانیشیدا پشت بە شێوازی ڕەسمیی سەرنجڕاکێش ببەستێت و لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە، دەبێ بەپێی پێویست ئەو شتانەی پێشکەشی شا دەکرێ، لە ئاستێکی زۆر باڵادابن. لەشایشەوە بەرەوخوار دەبێ هەموو کاربەدەستەکان، هەریەکەو بەپێی پۆستی خۆی چاوەڕوانی وەرگرتنی خەڵات بکات. ئەم بۆچوون و پێشبینییانە بەپێی هەلومەرجێك گرنگییەکی تایبەتییان هەبوو، بەتایبەتیش ئەو هەلومەرجەی، کە دەبوو ماڵکۆلم کاری تێدابکات. لەکاتێکدا، کە بە توندی بەتەنگ ئەو ئەرکەوەبوو، کە بۆی چووبوە ئەوێ، بڕیاریشی دابوو لە بەخشینی دیاری و خەڵاتیشدا دەست بڵاوبێ. هەروەها بڕیاریشی دابوو بەتەنگ مەسەلە گرنگە ڕەسمییەکانی ئەو ڕۆژگارەشەوە بێت.[87] بەڵام لەکاتێکدا خەریکی سەرچەماندنەوەی ئەم دوو قورسییەی سەر ڕێگاکەی بوو، بەدەم سەرهەڵدانی گرفتی سێیەمەوە سەردەمێکی سەختی گوزەراند.

ئەو لە ئاستێکی هێندە بەرزدا نەبوو، بەپێی پێویست بتوانێت دانووستاندنی هاوپەیمانێتییەکی گرنگ لەگەڵ دەسەڵاتە باڵاکانی ئێراندا بکات، ئەو تەنها نێردراوێکی فەرمانپێکراوبوو، بڵێین تەنها کاپتنێك بوو، بۆیە نیمچە نائومێدێك بوو لەبارەی سەرکەوتنی خۆیەوە بەسەر ئەو ئەرکەیدا. لەوانەیە چەند لاپەڕە نووسینمان پێویست بێ تەنها بۆئەوەی کورتەیەك لەبارەی ئەوەوە پێشکەش بکەین، کە ماڵکۆلم چۆن ئەم گرفتەی چارەسەر کردووە. بەڵام لە دووایدا بە پەنابردن بۆ بەهانەی هەڵبەستراو، هەڕەشە، بەڵێندان بۆ ماوەیەکی کاتیی چەند مانگێ، مەبەستەکەی خۆیی پێکا و ڕێگەی پێدرا بچێتە تارانی پایتەخت.

لە نووسینەوەی ژیاننامەکەی خۆیدا دەنووسێ"باڵەکەی خۆی بریتی بوون لە شەش پیاوی خانەدانی ئەورووپی، دوو کوڕ کە کاری ڕوپێوییان کردووە، ٤٢ سەرباز لە سوارەی چەکداری مەدراس، ٤٩ نارنجۆك وەشێنی خەڵکی مۆمبای، ٦٨ خزمەتکار و بەردەستی هیندی، ١٠٣ یاوەری فارس ، لەگەڵ ٢٣٦ و شەش خزمەتکار و یاوەری پیاوە

---

[87] ئەم دوو تایبەتمەندییەی خەڵکە ڕەسمییە کاربەدەستەکانی فارس، دیاری وەرگرتن و ڕۆتینی ڕەسمیی ئەو ڕۆژگارە زۆر بەباشی لەو سەرچاوەیەی پێشوودا و لە لاپەڕەکانی ١١١-١١٢ دا باس کراون . بۆ بینینی نمونەیەکی باش لەبارەی مۆدێلی زمانی ڕەسمییەوە بڕوانە ئەو سەرچاوەیەی خوارەوە.

خانەدانەکانی ناو ئەو ئەرکەی کاریان بۆ دەکرد."[88] بۆیە ئیتر شتێکی سەیر نەبوو بەهۆی ئەو خەرجییە زۆرانەوە زۆر ئاستەنگی دارایی لە هیند دەربکەون.

دواجار مالکۆلم گەیشتە تاران و دەستی دایە سازکردنی دانووستاندنی پەیماننامەیەکی سیاسی و یەکێکی ئابووری.[89] لە مانگی کانوونی دووەمی (١٨٠١) دا ئەم هەولانەی تاجی سەرکەوتنیان لەسەرنا. هەردوو هاوپەیمانێتییەکە لەلایەن (حاجی ئیبراهم خان) ی نوێنەر (فاز عەلی شا) و (کاپتن جۆن مالکۆلم) ی نوێنەری فەرمانڕەوای گشتیی هیندەوە ئمیزاکران. هاوپەیمانێتییە سیاسییەکە پێکهاتبوو لە دیباجەیەك و پێنج بەند و بەگشتییش هەموویان لەسەر خواستی بریتانیا بوون. بەرجەستەکردنی ئەو ئامانجە سەرەکییەبوون، کە بریتی بوو لە ئەرکە سەرەکییەکەی مالکۆلم، ئەویش دەیکردە پاراستنی هیند لە هەر دەستتێوەردانێکی فەرەنسی و ئەفغانی. شا قایل بوو کۆمەکی سەربازیی تەواو بۆ بریتانیا ئامادەبکات بۆ بەرەڤانیکردن لە هیند لە دژی هەرکام، یان هەردووکی ئەم دوو هێزە گومانلێکراوە. بەم دیویشدا بریتانیاش بەلێنی دا، کە ئەگەر پێویستی کرد شا بۆ بەجێگەیاندنی ئەو بەلێنانەی دابووی بریتانییەکان کەوتە شەڕەوە لەگەل فەرەنسادا (هەرچەند لە توانایاندابێت لە بارکردن و گواستنەوە و گەیاندنی سوپای ئێراندا کۆمەك بکەن و چەندیش پێیانبکرێت بەپێی پێویست گەنجینە و لۆجستی سەربازییان بۆ دابین بکەن.)[90] بەلێنی ئەوەی پێنەدرابوو، کە ئەگەر شەڕی لەدژی ئەفغانستان بەرپاکرد یارمەتیی پێبدرێت. رووسیاش، کە سەرەکیترین سەرچاوەی هەڕەشەی سەر شانشینیەکەی ئەو بوو، بەتەواوی فەرامۆش کرابوو. ئەم هاوپەیمانێتییە سیاسییە سەرکەوتنێکی تەواو بوو بۆ بریتانیا.[91] پەیماننامە ئابوورییەکەیش هەروەها بوو، ئەگەرچی بەدلنیاییەوە لەرووی گرنگییەوە ئەمەیان لەچاو سیاسییەکەدا شتێکی ناوەندی بوو. هەموو ئەو ئیمتیازە ئابوورییانەی پێشتر بە بریتانیا

---

[88] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١١٦.

[89] بۆبینینی باسێکی درێژ، بەلام سەرنجڕاکێشی ئەم دانوستاندنە بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو- لاپەڕەکانی ١١٧-١٥٤

[90] Aitchison, C. U., Treaties, Engagements and Sanads relating to India and neighboring countries (Revised ed., Calcutta, 1909), XII, 41-42.

[91] Text in ibid, 38-42 S synopsis of the treaty is given in Hertslet, Sir Edward, Treaties, etc., concluded between Great Britain and Persia, and between Persia and other powers, wholely or partially in force on the last April, 1891(London, 1891)1

درابوون نۆژەنکرانەوە(چەند شتێکی زۆری نوێی تریش بەدەستهاتن و هەروەها ئەو بڕی باجەیش، کە لە کڕیاران وەردەگیران کەم کرانەوە بۆ ڕێژەی لەسەدا یەك.)[92]

دوائاکامی ئەم پەیماننامانە ئەرکەکەی مالکۆلمیان بە کۆتاییەکی سەرکەوتوو گەیاند. لەمانگی کانوونی دووەمی (١٨٠١) دا ئێران و عووممان هاوپەیمانی بریتانیای مەزن بوون. هەروەها میسۆپۆتامیاش دۆست بوو، ئەگەرچی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بریتانیادا لە هەلومەرجێکی دانسقەدا بوو. وڵاتەکە بەناو لەژێر دەسەڵاتی سوڵتاندا بوو، بەڵام خۆی لەڕاستیدا لە بوونی تێزێکی گەورەی سەربەخۆیی بەهرەمەند بوو. والی (فەرمانڕەوا) ی بەغدا فەرمانی هەموو شتەکان بەدەست خۆی بوو، بەڵام بەناو سەر بە سوڵتان بوو، تەنانەت دوو فەرمانڕەواکەی تری بەردەستیشی، کە والییەکانی بەسرە و موسڵ بوون جاربەجار پاشای راستەقینە بوون و فەرمانیان بەسەر دەزگای دادوەریی خۆیاندا هەبووە. ئینگلیزەکان زۆر بە ئاگاییەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم راستییەدا دەکرد، بۆیە وا راهاتبوون بۆ هەر مەسەلەیەك پەیوەندیی بە میسۆپۆتامیاوە هەبوایە راستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵ والییەکاندا دەکرد. یەکەمین پەیوەندیی ئەوان لەگەڵ والیی بەسرەدا بووە، کە شوێنەکەی نزیکترین شوێن بووە لە کەنداوی فارسەوە. لە ڕێگەی ئەوەوە بوو توانییان تەنازولەکانی ساڵانی ١٦٣٩ و ١٧٢٨ و هەروەها ١٧٣١ یش بەدەستبهێنن. ئەم تەنازوڵانە یەك بەدوای یەکدا هەر بۆ ئەوە بوون ڕێپێدانێکیان پێ وەربگیرێ بۆ ئەوەی لەناو بەسرەدا کارگەیەك دروست بکرێ و باجی سەر کاڵا ئینگلیزییەکانیش دیاری بکرێ بە لە سەدا سێی نرخەکانیان. ئەگەرچی لەوە ناچێ دەقی هیچ کامی ئەم تەنازولانە لەبەردەستدابن، بەڵام ژمارەی ئەو بەڵگەنامەی بڕواپێکراوانەی ئاماژەیان پێدەکەن، کەم نین.[93] کۆنترین بەڵگەیەك، کە بوونی هەبێت ئەو فەرمانەیە، کە لەساڵی (١٧٥٩) دا لەلایەن سولەیمان پاشای والیی بەغداوە بۆ بریتانیا دەرکراوە. ئەو فەرمانەش سەلماندن و جەختی لەسەر کردنەوەیەکی دڵنیای سەر ئەو ئیمتیازاتانە بووە، کە تا ئەوکاتە لەلایەن ئاستانەوە بە بریتانییەکان درابوون.[94]

---

[92] Aitchison, op. cit., 7. Text of the economic treaty, ibid, 42-46

واتە بۆ بینینی دەقی پەیماننامە ئابوورییەکە بڕوانە سەرچاوە پێشووەکەی ئایچسن لاپەڕەکانی ٤٢-٤٦

[93] Aitchison, op. cit., XI, 1.

[94] دەقی ئەو فەرمانە لەسەرچاوەی پێشوودایە، لاپەڕە شەش، لەبارەی کۆنترینی ئەو تەنازوڵانەشەوە، کە لەلایەن ئاستانەوە پێشکەش کراون بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، بەشی یەك، سێکشنی یەك.

هەروەها بریتانیا دانانی چەند کرێگرتەیەکی بازرگانیی لە هەریەکەی بەغدا و بەسرە بۆ خۆی مسۆگەرکرد و ئەوەی ناو بەسرەیان تا نزیکی سەدەی نۆزدە بۆ ئەو زۆر گرنگ بوو. ئەو کرێگرتەیەی ناو بەسرە لەپێش ئەوی ترەوە کرا بە کۆنسڵ.(هێنری نێڤیل) ی باڵوێزی بریتانی لە ئیستەنبوڵ توانیی لەساڵی (١٧٦٤) دا فەرمانێکی ئاستانە بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی (ڕۆبەرت گاردن) لە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندییەوە بێت و وەك باڵوێزی بریتانیا لە بەسرە دەستبەکاربێت. ئەوەبوو ئیمتیاز و حەسانەی باش باری بەسەر یەکەمین کۆنسڵی بریتانیی دەستنیشانکراو بۆ میسۆپۆتامیادا.[٩٥]

لەبەغدایش ئاژانسێکی نیمچە هەمیشەیی دانرا، سەرەتا لەساڵی(١٧٥٥) دا ئەو پۆستە بە کابرایەکی ئەرمەنی پڕکرایەوە و دەساڵ پاش ئەویش ئینگلیزێك چووە جێگەکەی. لەساڵی (١٧٦٥) یشدا پرۆپۆزەڵێك بۆ دانانی ئاژانسێکی هەمیشەیی لە بەغدایش ئامادەکرا، بەڵام پرۆژەکە لەلایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکەوە پەسەند نەکرا. لەساڵی (١٧٨٣) دا پۆستەکە کرا بە هەمیشەیی و کەسێکی ئینگلیزی ڕەسەنی بۆ دەستنیشانکرا.[٩٦]

لەساڵی (١٧٩٨) ەوە بریتانیا کەوتە ئەوەی گرنگییەکی دیپلۆماتیانە بە بەغدا بدات. ئەوەبوو بریتانییەك لەوێ دیاری کرا (ئەرکە سەرەکییەکەی بریتی بوو لە گواستنەوەی هەواڵگران_ئیستیخبارات_ بەسەر وشکانیدا لەنێوانی بریتانیا و هیندستاندا و چاودێریی هەڵسوکەوتی نێردراوە فرەنسییەکان بکات و ڕاپۆرتیان لەبارەوەبدات، بەتایبەتییش ئەو پرۆژەیەی ناپلیۆن هەیبوو بۆئەوەی لەڕێگەی میسر و دەریای سوورەوە بتوانێت هیندستان داگیربکات.)[٩٧]

لە دوو ساڵی پاشتردا، کە بریتانیا کەوتە ئەوەی کاردانەوەی خەستی بەرامبەر بە مەترسییەکانی فرەنسا بۆسەر ڕۆژهەڵات هەبێ، ئیترگرنگیی دیپلۆماتییانەی بەغدا وەك شتێکی بەرچاو دەرکەوت.

لە ساڵی (١٨٠٢) دا (لۆرد ئێلجین) ی باڵوێزی بریتانیا لە ئیستەنبوڵ داوایەکی ئیمپارتۆرییانەی لە سوڵتانەوە پێگەیشت، تێدا ئاگادار کرابۆوە، کە ئاستانە (هارفەرد

---

95 دەقی فەرمانەکە و هەروەها بروانامەکەی باڵوێزی بریتانیاش لە ئیستەنبوڵ لەشکۆی ئەو فەرمانەدا، لەناو سەرچاوەی پێشوودا هەن، لاپەڕەکانی ٦-٩.

96 Longrigg, op. cit., 188; Aitchison, op. cit., 2.

97 هەمان سەرچاوەی پێشوو، لۆنگریگ، لاپەڕە ٢٥٤

جۆنز) ی وەك باڵوێزی بریتانیا لە بەغدا و دەوروبەرەكەی بەلاوە پەسەندە.[98] ئیمتیازی تەواو و حەسانەی بێشومار رژان بەسەر جۆنزیشدا. بۆ نموونە دەیتوانی لەگەڵ دەستوپێوەندەكانیدا و بەخواستی خۆی بەناو تەواوی ولاتەكەدا گەشت و هاتوچۆ بكات، هەر خواستێكی هەر كۆمەكێكی هەبووایە بۆی جێبەجێ دەكرا. بە رێكەوت و لە بەختی باشی ئەو، والیی بەغدایش هەر وەك سوڵتان دۆستی بریتانییەكان بوو.ئەم والیی بەغدایە سولەیمان پاشای پیر بوو، كە نازناوەكەی (بویوك) بوو (بویوك ووشەیەكی توركییە بەمانای گەورە دێت– و–) لەساڵی (١٧٨٠) دا لەلایەن (مستەر لاتۆچ) ەوە، كە بە كرێ گیراوێكی ئینگلیز بوو، بۆ پاراستنی حوكمی خۆی لە بەغدا یارمەتیی درابوو.[99] والیی بەغدایش هەروەكو سوڵتان و شا و ئیمام، بەدڵنیایی سۆزی بەرەو بریتانییەكان هەبوو.

بۆیە پاش نزیكەی سێ ساڵ لەچالاكیی سیاسی و سەربازی(لە ١٧٩٨–١٨٠١)بریتانییەكان نەك هەرچی گریمانێكی دوژمنایەتیكردنی ناپلیۆنیان بەرامبەر بە هیندستان تێكشكاند، بەڵكو خۆشیانیان وەك خوازراوترین هێزی بێگانەی ناو تەواوی ناوچەی ئستانبووڵ تا كەلكوتا جێگیر كرد. هەرچی ئاستانەیە هاوپەیمانێكی تەواوی ئەوان بوو. هیندستانیش بەباشی لەژێر كۆنترۆڵیاندا بوو. عووممان بە هەموو خواستەكانی بریتانیا لەبارەی فرەنساوە قایل بوو. ئێران بەڵێنیدابوو لەكاتی وەلامدانەوە بە هەر مەترسییەك، كە بۆسەر هیندستان دروست ببێ هاوكاری بكات. بەغدایش بۆ یەكەمین جاری خۆی بووە شوێنی نیشتەجێبوونی كونسڵخانەیەكی گرنگی بریتانی. لەوێدا، كە هەموو ئەو دەستكەوتە باشانە بەدەستهاتبوون ئیتر بەدڵنیاییەوە دەبوو دامەزراوەیەكی بەزەبری بریتانی بۆ كۆنترۆڵكردنی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دابمەزرێنن. كەچی لەبریی ئەوە هەموو ئەم شتانەیان فەرامۆش كرد و بە زوویش لەدەستیان دا. ئیتر پێویست بوو سەركەوتنێكی یەكجارەكیی تری بریتانی بەسەر بۆناپارتدا بەدەست بێتەوە بۆئەوەی بتوانن جارێكی تر ئەم كۆنترۆڵە هەمیشەیی و ناكاتییە چەسپیوە بەدەست بێتەوە.

---

[98] دەقی ئەم بروانامە ئیمپراتۆرییە عوسمانییە لەناو كتێبەكەی ئایتچسۆندا هەیە، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرەكانی ٩–١٠ بەلام لە بەروارەكەیدا ئەوە نەهاتوە، لە چ مانگێكدا ئەو بروانامەیە دەركراوە.

[99] Longrigg, op. cit., 196-254. on the impressive reign of Suleiman Pasha Buyuk (1780-1820), see ibid, 195-220. The Turkish word (BUYUK) means great.

# دووایین قۆناغی کێبەرکێی
# ئەنگلۆ- فرەنسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا
# ١٨٠٢-١٨٠٩

## ١. نوچدانی باڵادەستیی بریتانیا لە ١٨٠٢ - ١٨٠٧

یەکەمین سەرکەوتنی بریتانیا بەسەر بۆناپارتدا بەڕووداوێك کۆتایی هات، کە ئەتوانین بڵێین سەرەتای سەردەمێکی کاردانەوەی بەرامبەر بە بریتانیا دروستکرد. ئەو رووداوە بریتی بوو لە هەرەسی پرۆژەیەکی گەورەی هاوبەشی سەربازانی رووسی و فرەنسی. پرۆژەکەشی لەلایەن (پۆڵ ی یەکەم) ی رووسیاوە ئامادەکرابوو، کە لە مانگی کانوونی دووەمی (١٨٠١) دا ئاشتیی لەگەڵ بۆناپارت کرد و هاوپەیمانێتییەکیشی لەگەڵدا گرێدا. هەر لە (٢٧) ی ئەو مانگەدا ئەو پلانە تۆکمەیە لەلایەن قەیسەرەوە نێردرا بۆ کۆنسڵی یەکەم.[١٠٠] بۆناپارت، ئەگەرچی بیرۆکەکەشی پەسەندکردبوو، بەڵام کەمتر لە کەسایەتیی سەیری تزار گەشبین بوو بەرامبەر بەوەی ئەو پلانەی دایان نابوو کاریگەرییەکی هەبێ. بەو دیوەکەی تردا پۆڵ سەرمەستی ئەوەبوو، کە تازە هەرێمی گورجستان لکابوو بە ئیمپراتۆریاکەیانەوە، بۆیە زۆر گەشبین بوو، هەر بەڕاستییش ئەو سوپایەی لە هەرێمی قەوقاز هەبوون کەوتبوونە رێگە بەرەو هیندستان، بەڵام هەر لەو دەمانەدا و لەرۆژی (٢٣/ ئادار/ ١٨٠١) دەوە لەلایەن دەستەیەکی پیاوکوژانەوە کۆتایی بە ژیانی هێنرا و پرۆژەکەشی لەپرێکدا سەری تێداچوو. بەرپرسێکی شارەزا لە کاروباری ناوچەی فارس

---

[100] بەپێی پلانەکە سوپایەکی رووسی خرابۆوە ئامادەباشییەوە، بۆئەوەی لە ئۆرینبۆرەوە و بەرێگای بوخارا و کیێڤدا بکەوێتە جووڵە و سوپایەکی فرەنسیش لەژێر فەرمانی (ماسینا)دا بەناو روباری دانوبدا بچنە خوارەوە بۆ تاگەنۆرگ ولەوێشەوە بەناو دۆن و ڤۆلگادا بچنە ئەستراخان و لە ئەستراخانیش لەگەڵ هێزە رووسییەکان یەکبگرن و ملی رێگەی هیرات و قەندەهار بگرنەبەر. بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:

47-48, IX, Cambridge Modern History.

دەڵێت(ئەگەر ئەو پیلانە قەوارەی بگرتبا، بەدڵنیاییەوە بە کارەسات کۆتایی پێدەهات، هۆکاری ئەم قەوارەنەگرتنەش هەر بە تەنها ناگەڕێتەوەسەر کەمیی کەرەستە و بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هێرش و پەلاماری هۆزە خۆجێییەکان و دووری و نالەباریی هێڵی پەیوەندی پێوەکردن لە هەر یەکەی فڕەنسا و قۆڵگاوە بۆ هیندستان).[101]

سەرباری ئەمانەش بۆناپارت پێیوابوو، لە ململانەکردنی دژی بریتانیای مەزندا، چ لە رۆژهەلاتدا بیّ، یان لە رۆژئاوا، قەیسەر (تزار) هاوپەیمانێکە نابیّ دەستی لێهەڵبگیرێت. بۆیە لەدەستدانی ئەو هاوپەیمانە بەلای ئەوەوە کارەساتێك بوو(کۆستێك بوو). تەنانەت کوژرانەکەشیی وا باسکرد، کە بە فیتی بریتانیا کرابیّ. سەرسوڕمانی ئەو، بەو کوژرانە شتێکی سەیر نەبوو، چونکە مەرگی پۆڵ هەر تەنها کوژاندنەوەی دووایین پزیسکی هاتنەدیی ئەو ئومێدانەی بۆناپارت نەبوو، کە لەبارەی میسر و هیندستانەوە هەیبوون، بەڵکو پەیوەندیی بەوەشەوە هەبوو، کە پەلامارەکەی بریتانیا بۆسەر (کۆبنهاگن) کۆتایی بە(بێلایەنیی چەکدارانەی باکوور) یش هێنا. بەپێی ئەو بێلایەنییە رووسیا هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵ چەند ولاتێکی سکەندناڤیدا هەبوو، ئەو هاوپەیمانێتییە وایدەکرد بریتانیا نەتوانێت ئەو کەشتییانە بپشکنێت، کە کالای بە قاچاخبراویان بۆ فڕەنسا دەبرد. لە مانگی مایسی (١٨٠١) دا سوید و دانیمارك لەبارەی گرفتی بایکۆتکردنەوە لەگەڵ بریتانیادا بەرێکەوتنێك گەیشتن و لە (١٧/حوزەیران/١٨٠١) یشدا دیسان بریتانیا لەگەڵ رووسیاشدا بە لێکتێگەیشتنێك گەیشتن. (دەچ) پێماندەڵیّ: ئیتر فڕەنسا لە هەموو رووییەکەوە گەڕایەوە سەر ئەوەی، کە دەبیّ تەنها بەتەنگ ئەوەوەبیّ (بە ئاشتی) سەرچاوەی داهاتەکانی خۆی بپارێزیّ و ئەمەیان سەرکەوتنە بۆئەو.[102]

سەرەکیترین بەرەنجامی سەرنەکەوتنی بۆناپارت بەدەست بریتانییەکانەوە ئەوەبوو: لە ساڵی (١٨٠٢) دا ئاشتیی (ئەمیەن) ی پەسەند کرد. بەلای بریتانیاشەوە بۆناپارت لەسەرەتاوە وەك مەترسییەکی گەورە وابوو بۆسەر هیندستان. هێشتا کاری دوژمنکارانەی بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکانی ئەوان لە رۆژهەلاتدا هەستی پێدەکرا. بەلام بەپێچەوانەی ئەوەوەی لە ساڵی (١٧٩٨) دا لێی چاوەڕوان دەکرا، ئێستا ئیتر بەگشتی

---

[101] سایکس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٠٠.

[102] Deutsch, H. C. The Genesis of Napoleonic Imperialism (Harvard University Press, Cambridge, 1938), 22. On the seriousness of the Tear's death to Bonaparte, see ibid, 21.

مەترسییەکانی خامۆش بووبوونەوە. بەدڵنیایی لەو دەمەدا، کە دانووستاندنی ئاشتی لەناو هۆڵی هەردوو پەرلەماندا دەچووەپێشەوە و دەنگی گەشبینییش بەرز بوو، دەنگی گومانکردن لە نیازەکانی بۆناپارت بەرزبۆوە.(ئێرڵ کارلیزل و میستەر ئەلیۆت) لەماڵی خۆیانەوە هاواریان لێ هەستا، کە لەو کاتەدا دانووستاندنی ئاشتی بەڕێوەچووە، بۆناپارت چەندان کەشتیی پڕچەك و زەخیرەی جەنگیی بەرەو ئینديز خستۆتەڕێ. میستەر ئەلیۆت حەکیمانە زەنگی ئاگایی ئەوەی لێدا، کە بۆناپارت لە هەوڵی ئەوەدابووە ئەو کاتی ئارامییەی بریتانیا بەدیوی هەڵەیەکی ئاسایشیی گەورەدا، بەرێ، بۆئەوەی بتوانێت لەچرکەساتێکی یەکلاکەرەوەدا و لە ناو جەرگەی ئیمپراتۆریاکەی بریتانیادا چالاکانە ئاژاوەی خۆی بنێتەوە. حکومەتی بریتانیش، کە بۆخۆی ئاگاداری نیفاق و نیازەکانی بۆناپارت بوو، پێیوابوو، کە ئەو ئاشتییە لەوەدا باشترە، کە شتێکی لە شەڕکردن کەمترە. بۆیە (ووتیان ئەو هەستەی ناو ئەو ماڵە لەم کاتەدا زۆر حەساسە و زیادەڕەوییە ئەگەر بێین روونکردنەوەی تەواوی بۆبکەین).[103] ئاشتی هاتەبەرهەم و بۆناپارتیش بەشێوەیەکی جەوهەریی خۆیی لە رۆژهەڵاتدا سازدایەوە و سەرلەنوێ کەوتەوە بوونیادنانەوەی هەندێ لەو بنکانەی خۆی لەو ناوچانەدا هەیبوون، بۆ دژایەتیکردنەوەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە رۆژهەڵاتدا.

خێراترین کایەی نوێکراوەی چالاکییەکانی ناپلیۆن بریتی بوو لە ئیمپراتۆریای عوسمانی و دواتر لەمەوە هەموو حەوزی رۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستی داپۆشییەوە. کاربەدەستانی فرەنسی تەنانەت پێش کۆتایی ساڵی (١٨٠٢) یش لەو بەشەی جیهاندا سەرقاڵی کارکردن بوون، مەیلی خەڵکە کاربەدەست و فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچانەیان بەلای خۆیاندا راکێشابوو، هەمووشیان لەبارەی ناوچەکانی کارکردنی خۆیانەوە راپۆرتی وردو تەواوایان رەوانەی نیشتمان دەکردەوە.[104] ئەم چالاکییانە گومانی بریتانیایان جولاندەوە و هەر زوو لەگەڵ هەندێك شتی تردا بوونە مایەی دڕان و لێکهەڵوەشانەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی نێوانی ئەم دوو وڵاتە.

---

[103] Parliamentary History of England, XXXVI, 1801-1803, 312-314.

[104] Authentic official documents relative to the negotiation with France (Chappell, London, 1803), "Declaration" III-XVI.

ئەم راگەیاندنە رەسمییە جۆرە سەرەتاو ناسینێکە بۆ ئەو بەڵگانە، ئاماژە بەو گرفتە سەرەکییانە دەکات، کە لە ساڵی (١٨٠٣) دا بوونە هۆی دڕان و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی ئەنگلۆ-فرەنسییەکان، لەم راگەیاندنەدا بۆچوونی تایبەت تێکەڵی حەقیقەتەکان نەکراون.

زووترین ڕووداوێك، كه بووه هۆی سەرهەڵدانەوەی دوژمنایەتی، بریتی بوو لە ڕاپۆرتە بەناوبانگەکەی نێردراوی فرەنسی (هۆراس سێبیستیانی). ئەم کۆلۆنێل سێبیستیانییە لە مانگی تشرینی یەکەم و تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٠٢) دا گەشتێکی بە میسر و سوریادا کردبوو. لەو شوێنانە چاوی بە چەندان کەسایەتیی گرنگ کەوتبوو، لەبارەی توانا سەربازییەکانی بریتانیا و تورکیا لەو ناوچانەدا زانیاریی گرانبەهای کۆکردبۆوە. ئەو ڕاپۆرتەی ئەو لەو گەیشتە گرنگ و بەرچاوەیدا ئامادەیکردبوو، گەمژانە ڕۆژی (١٨٠٣/١/٣٠) لە بڵاوکراوەی(مۆنیتەر) دا بڵاوکرایەوە. ئەو بڵاوکردنەوەیە یەکسەر بارێکی نائاسیی قورسی بەدرێژایی کەناڵەکەی نێوانی بریتانیا و فرەنسادا دروست کرد.[105]

بیروڕایەکی جەماوەریی بریتانیی زۆریش لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە بڵاوکرایەوە، ئەمەش ئارەزووی حکومەتی بۆئەوە جوڵاند بکەوێتە جووڵە و وەستانەوەیەکی خۆی لەدژی پلانەکانی بۆناپارت گەڵاڵە بکات.

ئاشتییە لەرزۆکەکەی (ئەمیەن) یش نەیتوانی لەبەرامبەر ئەم دژ بەیەکتر وەستانەوەی بەرژەوەندی و ترسانەدا زیاتر ڕابوەستێت. بۆیە دیسان لەساڵی (١٨٠٣) دا بریتانیای مەزن و فرەنسا دوو دوژمنی چالاکی بەرامبەر بە یەکتری وەستا بوون.

لە چەند ساڵێکی دواتردا گۆڕەپانی سەرەکیی بۆ چالاکییەکانی بۆناپارت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بریتی بووە لە ئێران. بۆیە ئیتر ئەم وڵاتە لەلایەن بریتانیاوە و بە سیاسەتێکی خۆپەرستانەی ڕەها فەرامۆش کرا. ئەوەشمان لەیادە، کە لەم چەند ساڵەی دوواییدا ، هەر بریتانیابوو وای لە شا کرد، کە وەك دڵسۆزترین هاوڕێ و باشترین هاوپەیمان بیر لە بریتانییەکان بکاتەوە. بۆیە بەم پێیە بوو، کە شا لە (کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٠١) دا هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵ مالکۆڵمدا ئیمزاکرد و بەوپێیەش ئیمتیازاتی باشی بەپێی پێویست پێدان و هەر ئەویش بوو، بەڵێنی پێدان، کە ئەگەر فرەنسا، یان ئەفغانستان، یان هەردووکیان پێکەوە پەلاماری هیندیان دا، ئەوا ئەمان هاوکاریی تەواویان پێشکەش بکەن. لە وەڵام و کاردانەوەی ئەو هاوڕێیەتییە بێمایەیاندا شا هات باڵوێزخانەیەکی بە سەرۆکایەتیی (حاجی خەلیل خان) ڕەوانەی هیندستان کرد. بەڵام حاجی بەڕێگاوە بوو بۆئەوەی لە هیند پۆستەکەی خۆی وەربگرێ، کەچی لە

105 For an English version of the report, see ibid, App. I, 1-10.
On its far-reaching effect upon English public opinion at the time, see Coquille, P., Napoleon and England, 1803-1813 (English translation by Gordon Knox, London, 1904), Ch. IV, 28-36.

شەڕێکی نێوانی خزمەتکاران و پاسەوانانی خۆیدا کوژرا و حکومەتی هیندییش بەو بۆنەیەوە نیگەرانیی زۆری خۆیی بۆ شا دەربڕی. هەمان حکومەت مووچەیەکی خانەنشینیی تەواوی تەمەنی بۆ کوڕی نێردراوە کوژراوەکە بڕییەوە، کە بڕەکەی بۆ هەر مانگێك (٢٠٠٠ روپیە) بوو، کە دەکاتە (١٥٠ پاوەندی ئیستەرلینی)[106] ئەگەرچی بریتانییەکان ئەم سیاسەتەشیان گرتبووە بەر، بەڵام هەر پێیان وابووە، ئێران ئەو هاوپەیمانەیە، کە نابێ دەستی لێهەڵبگیرێ. کاتێك، کە بە هەڵەی بۆناپارت ئەوە روون بۆوە، ئیتر ئەم کابرایە مەترسییەکی بۆسەر ئەورووپا و رۆژهەڵاتی نزیك نەماوە، ئێرانیش کەوتەوە هەوڵی دۆستایەتیکردنی بریتانیا. نێردراوی تازەی ئێران بۆ هیندستان بریتی بوو لە ژنبرای حاجی خەلیل خان، کە لە رێگادا بەرەو ئەوێ کوژرا. ئەمیان لەساڵی (١٨٠٥) دا نێردرا بۆ هیندستان دەبوو لەماوەی دوو ساڵدا بگەڕێتەوە ناو نیشتمانی خۆی، بۆیە زۆر نائومێد بوو.(لێرەوە ئیتر ئێران بە تەواوی لەلایەن کەلکەتاوە فەرامۆش کرا.)[107]

ئەو سەرکەوتنەی، کە بریتانیای سەرمەست کردبوو، روانینێکی هەڵەی لەبارەی هەلومەرجی ئاسایشەوە لەلا دروست کردن و وایلێکردن ئێران بەتەواوی فەرامۆش بکەن کاریگەرییەکی جیاوازی لەسەر لایەنی بەزیوو هەبوو.

بۆناپارت هەر بەزوویی پاش ئەوەی (ئاشتیی ئەمیەن) بە کۆتایی گەشت، بۆ یەکەم جار گرنگییەکی راستەقینەی دا بە ئێران. زانیارییەکی باشی لەبارەی هەلومەرجی ئەم ناوچەیە و ناوچەکانی تری رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستەوە لەلایەن ئەو کرێگرتانەی خۆیانەوە بۆ دەهات، کە لەو رۆژگارەدا و لەپاش ساڵانی سەرکەوتنی بریتانیا (١٧٩٨–١٨٠١) لەو ناوچانەدا لەناو پۆستەکانی خۆیاندا مابوونەوە و کاریان دەکرد.

لە سێپتێمبەری ساڵی (١٨٠٣) دا فەرمانی بە(تالێراند) کرد، کە لە نزیکەوە ئاگاداری کاروباری سیاسی و ئابووریی ئێران بێت. لە بەهاری ساڵی پاشتردا ئەوەی بە هەند وەرگرت، کە نوێنەرێکی خۆی بنێرێتە ئەو وڵاتە، بۆئەوەی زانیاریی تازە و نوێی بە بەها

[106] ئەم کوڕە ماوەی شەست و پێنج ساڵ ئەم مووچەیەی وەرگرت و دووایش لە پاریس مرد، بە درێژایی پەنجا ساڵ هەرچی ئۆپێرا نمایش بکرایە، ئەم دەچووە دیتنی، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ن ٣٠٢.

[107] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کۆبکاتەوە.[١٠٨] بەڵام هەلومەرجی ناو ئێران هێشتا بۆ دەستپێکردنی هاوپەیمانێتییەکی (فرانکۆ–ئێرانی) لەبار نەبوو. وڵاتەکە هێشتا بە تەواوی نەکەوتبووە بەر گوشاری دوژمنایەتیی وڵاتانی بێگانەوە و هێشتا شایش دەیویست دەست بەو بڕوایەی خۆیەوە بگرێ، کە بریتانیا لە کاتی پێویستدا هاوڕێیەکی باشە.

لەساڵی (١٨٠٥) دا شا فاز عەلی مەرگی خۆیی بەئاوات دەخواست، چونکە تاڵاوی زۆری بە دەستی رووسەکانەوە چەشت. لەو ساڵەدا (باکۆ و داغستان) ی لەدەست دابوو، هەڕەشەی زیانی گەورەتریشی لەسەربوو، کەچی هێشتا تا چاوبڕیکات هیچ ئاماژەیەکی هیچ یارمەتییەك لەلایەن بریتانیاوە دیار نەبوو. بۆیە بەناچاری پەنای بۆ هاوپەیمانێتییەکەی ساڵی (١٨٠١) ی نێوانیان بردەوە، بەڵام ئەم بەڵگەنامەیەش لە دژایەتیکردنی رووسیادا هیچ یارمەتییەکی لێ نەهاتەبەرهەم. بەڵگەکەش خۆی لەڕاستیدا هیچ جۆرە یارمەتییەکی وای تێدا دیاری نەکرابوو، کە لەلایەن بریتانیاوە پێشکەشی شا بکرێ.[١٠٩] ئەم هەڵسوکەوتە هەر بەڕێکەوت نمونەیەکی باشی یاریکردنی دیپلۆماسییانە بوو، بەڵام پاشتر بەڕێبەرایەتیی بریتانیا بوو بە (هونەر) ێك، هونەری ئەوەی بە بەهانەی هاوڕێیەتی یان هەر بەهانەیەکی ترەوە(چەند زۆرت ویست وەریبگرە و چەند کەمت لەدەستهات ئەوەندە بدە). ئێران بەپێی کاغەزی نووسراوی هاوپەیمانێتییەکە و بەپێچەوانەی رووحی دیباجەکەیەوە، نەیتوانی لەدژی رووسەکان چاوەڕوانی هیچ یارمەتییەك لە بریتانییەکان بکات.[١١٠] شا هەرچی گوشارێکی هەبوو بەکاری هێنا، ئینجا بایدایەوە بەلای بۆناپارتدا بۆئەوەی ئەو بەڵێنی فریاکەوتنێکی پێبدا.

لە وەڵامی نامەیەکدا، کە لە شاوە پێیگەشتبوو، بۆناپارت فەرمانی بە (ئامێدی جوبێرت و ئاجیوتانت جەنەراڵ رۆمیۆ) کرد، کە بچنە ئێران، یەکەمیان بۆ گرنگیدان بە

---

[108] Shupp, F. P. The European Powers and Near Eastern Question, 1806-1807 (New York, 1931), 433; Sykes, op. cit., II, 303.

[109] بڕوانە ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە لاپەڕە(٤٧–٤٨) بریتانیا بەڵێنیدا کە کۆمەکی بۆ بنێرێت، چەند لەتوانادا هەبێت بیانداتێ. لە بیری مالکۆڵمدا هەبوو، کە ئەگەر پێویستیی شتپێدان هاتەپێش، چەند لە توانایاندابوو، یارمەتییان بدەن.

[110] تا ئەو کاتە هێشتا بریتانییەکان هیچ جووڵەیەکی ئەوەیان لێ دەرنەکەوتبوو، کە گوێ بە جموجووڵەکانی رووسیا بەرامبەر بە فارس بدەن، چونکە تا ئەو سەردەمە و تا رۆژگاری پاش کۆتایی سەردەمی ناپلیۆنیش رووسیا دراوسێیەکی وا نەبوو حسابی لەسەر بکرێ.

کاروباری سیاسیانەی ئەو ئەرکەی بۆی چووبوون و ئەوی تریشیان بۆ کاروبارە سەربازییەکەی ئەرکەکە.

جۆبێرت لە رێگەدا بەرەو ئێران، کە بە ناوچەی عوسمانییەکاندا تێدەپەڕی دەستبەسەرکرا، بۆیە بە چەند مانگ پاش (ڕۆمیۆ) و لە حوزەیرانی (١٨٠٦) دا توانیی بگاتە ناو ئێران. بەڵام بە ماوەیەکی کەم پاش گەیشتنی جۆبێرت، ڕۆمیۆ مرد و جۆبێرتیش ناچار بوو خۆی بەتەنها گرنگیی ئەرکەکەیان لەئەستۆ بگرێ. هەروەها گەیشتنەکەی جۆبێرت لەو کاتەدا زۆر گونجاو بوو، چونکە شا تازە لەناوچەی (عەسکەران) بەزینێکی بەدەستی رووسەکانەوە خواردبوو، لەپاڵیشەوە هەردوو ناوچەی (باکۆ و داغستان) – یشی لەدەستدابوو. سەرباری ئەمانەش هاوارەکانی شا بۆ بریتانیا بۆئەوەی یارمەتیی بدەن، ماوەی دووساڵ بوو لەلای بریتانیاوە خرابۆوە ژێر باس و لێکۆڵینەوەوە، بەبێ ئەوەی ئەنجامێکی بەرجەستەی هەبێ.[111] بۆیە شا بڕیاری دا، کە لەگەڵ ئەو نەتەوەیەدا، کە خۆی زۆر رقیشی لێیان بوو، ببێت بە هاوپەیمان، چونکە چەقۆی رووسەکان گەیشتبووە سەر ملی پاشا. ئەوەبوو هاوپەیمانێتییەکی بەرایی لەگەڵ جوبێرتدا دەستی پێکرد و هەر زوو نێردراوێکی ئێرانی لەگەڵ جوبێرتدا چوو بۆ ئۆرووپا بۆ فەرمانگەکەی (تۆلیراند) لە(فینکنشتاین) چونکە دەبوو دوا پەسەندکردنی هاوپەیمانێتییەکە لەوێ بەڕێوەبچێت.

ئامانجی دیپلۆماسییەتەکەی بۆناپارت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و لەو سەردەمەدا ئەوەبوو هاوپەیمانێتییەکی بەرەنگاریکردن و هێرشکردن لەنێوانی فرەنسا و تورکیا و ئێران لەدژی بریتانیا و رووسیا دروست بکات. هەریەکەی تورکیا وئێران رقی قووڵیان لە رووسیا بوو، چونکە ئەم دوولایەنە هەردووکیان لەو کاتەدا بەتەنگ ئەوەوەبوون قەرەبوویەکی ئەو زیانانە بکەنەوە، کە لە ناوچەکانی خۆیاندا لێیانکەوتبوو، تورکیا نیگەرانی زیانەکانی ناوچەی (ڤالاچیا و مۆڵداڤیا)ی خۆی بوو، ئێرانیش بۆ (گورجستان). بۆناپارت یارییەکی زۆر کارامەییانەی بەم ترس و هیوایانەوە کرد. ئەگەرچی تا ساڵی (١٨٠٦) یش نەیتوانی هیچ هەنگاوێکی بەرچاو بەرەو ئامانجەکەی خۆی هەڵبنێت. هەر لەو ساڵەدا، کە ئاماژەمان پێدا جوبێرت ئەرکەکەی بۆ ئێران دەستپێکرد، لە دووەم رۆژی مانگی مایسی هەمان ساڵدا (ژەنەراڵ هۆراس سیباستیانی) کەسێتیە دیپلۆماتە دیار و بەرچاوەکەی فرەنسا وەك باڵوێز بۆ ئیستەنبوڵ دیاریکرا. ئەرکە پڕهیواکەی

[111] Sykes, op. cit., Ii, 304; Aitcheson, op. cit., Xii, 7-8; Shupp, op. cit., 434.

سیباستیانی تەنها بۆئەوە نەبوو، کە پێکەوە هاریکارییکردنێکی فرانکۆ-تورکی لەدژی ئینگلتەرە و رووسیا دڵنیابکات، بەڵکو دەبوو تورکیایش قایل بکات بۆئەوەی فریاگوزارییەکی سەربازییانەی تورکی بۆ ئێران مسۆگەر بکات، لە ململانەکردنی دژی رووسیادا.

سیباستیانی کارەکانی ناو ئەرکەکەی لێهاتووانە چارەسەر کرد و هەوڵی درێژخایەنیشی خستەگەڕ بۆ وەستانەوە بەرووی توانا بێشومارەکەی بەرەنگاریکردنی بریتانیادا.[112] لەم دەمەدا و لەلایەن پاشا کاراکەیەوە کۆمەکێکی دیپلۆماتییانەی باشی بۆهات. ئەوەبوو لەرۆژی (١٨٠٧/١/١٧) دا بۆناپارت نامەیەکی بۆ شا نارد و تیایدا نووسیبووی، کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئێران بتوانێت بە یارمەتیی فریاگوزاریی فرەنسا و تورکیا، گورجستان بەدەستبهێنێتەوە. لەرۆژی بیستی هەمان مانگدا نامەیەکی تری بۆ سوڵتان سەلیمیش نووسی وتێیدا داوای لێکرد بەشداریی گەلەکۆمەکی فرەنسا و ئێران بکات لەدژی رووسیا، کە دوژمنی هاوبەشی هەموویانە. هەر لەو کاتەدا سیباستیانی (کە دیپلۆماتێکی بەتوانا و کاریگەر بوو لە ئیستانبوڵدا) راسپارد داوا لە سوڵتان بکات بۆئەوەی یارمەتییەکی سەربازی بۆ شا ئامادەبکات، کاتێك شا دەکەوێتە ململانەکردنی دژی تزارەوە. بەم شێوەیە لە رێگەی هەوڵە لێهاتوەکانی باڵوێزەکەی و هەروەها لە رێگەی ناوبانگەکەی خۆی و باش هەڵکشانیەوە بەهۆی ئەو غەزووانەوە، کە کردبوونی کاریگەریی بۆناپارت لەسەرەتاکانی ساڵی (١٨٠٧) دا گەیشتبووە دوالوتکەی خۆی. لەکۆتایی مانگی شوباتی ئەو ساڵەدا دانووستاندنکارانی هەریەکە لە تورکیا و ئێران لە (وارشۆ) چاوەڕوانییان دەکرد گفتوگۆکانی رێکەوتنیان لەسەر ئەو هاوپەیمانێتییانە دەست پێبکەن، کە ئامانجەکانی بۆناپارتیان دەگەیاندە ئاکام.[113] ئەو ئاکامە گرنگانەی کە لەو دانووستاندنانە کەوتنەوە لێرەوە و هەندێ بەدرێژی و وردی باسیان لێ دەکەین.

لەکاتێکدا، کە نفوزی بۆناپارت لە رۆژهەڵات و هەروەها رۆژئاوایشدا بەرو لوتکە دەکشا، توانای بەرەنگاریکردنی بریتانیاش بە لاوازترین قۆناغی خۆیدا تێدەپەڕی. سەرباری شەڕەنگێزییەکانی ئەو سەردەمەی فرەنسا لە ئۆروپادا و نەخشە

---

[112] ئەم باسە بەباشی و وردی کارە لە سەرچاوەکەی شەپدا باسکراوە، سەیری ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:
The European Power and the Near Eastern Question, 1806-1807.

[113] Ibid, 295-296. on Sebastiani's mission at the porte see ibid, 75-77, and on his increased influence there, ibid, 283-284

خراپەکانیشی لەناو ئاسیادا لە زۆربەی رۆژگاری سالّی (١٨٠٦) دا دانووستاندنی نێوانی بریتانیا و فرەنسا هەر بەردەوام بوون. بریتانیا بیری وابوو، یان هیچ نەبێ ئەو ئومێدەی هەبوو، کە بتوانێت لەگەلّ ئەم داگیرکەرە نیگەران و بێپشوەدا بە رێکەوتنێك بگەن، کە هیچ نەبێ بەرژەوەندییەکانی خۆیانی پێ بپارێزن. راستیی روونی ئەم دانووستاندنانەش لەناو گوتارێکی بۆناپارتدا باسکراوە، کە لە رۆژی (٢/ ئادار/١٨٠٦) دا ئاراستەی ئەنجومەنی یاسادانانی فرەنسیی کردووە و تێیدا وەك کەسێکی سەرکەوتوو وتویەتی: "من ئارەزووی ئاشتی دەکەم لەگەلّ ئینگلتەرەدا. هێندەی پەیوەندیی بە منەوە هەبێت بۆ خۆم تەنها یەك خولەکیش دواینا‌خەم، هەروەها هەمیشەیش ئامادە دەبم دەستی پێبکەم و مەرجەکانی ناو رێکەوتنامەکەی "ئەمیەن"یش بکەمە بناغەی ئاشتییەکە " بە سێ رۆژ پاش ئەوە (میستەر تۆلیراند) ی وەزیری کاروباری دەرەوەی فرەنسا دەقی ئەو گوتارەی گەیاندە (فۆکس) ی وەزیری کاروباری دەرەوەی بریتانیا و ئەوەشی خستە سەر، کە (ئینجا ئێوە دەبینن ئێمە هێشتا هەر خواستمان ئاشتییە، من پرسیاری ئەوەیش ناکەم کە داخۆ ئاراستەی باوی ئێستەی لای ئێوە چییە، بەلاّم ئەگەر هەر کەمێکی باشییەکانی ئاشتیکردنیشتان لەبەرچاوبێ ئەوە دەزانن دەبێ لەسەر چ بناغەیەك قسەوباسی لە بارەوە بکەین.)[١١٤]

بە بەلّگەی پەیامەکەی (تۆلیراند) و هەلومەرجە سیاسی و سەربازییەکەی بۆناپارتیش دەردەکەوێ، کە فرەنسا بەشێوەیەکی رەها ناچاربووە ئاشتی بکات. ئینجا وەلاّمەکەی (فۆکس) لەو کاتەدا پیشانماندەدات کە بریتانیاش لە فرەنسا پتر بەتەنگ ئاشتیکردنەوە بووە.[١١٥] بەلاّم ئەم بەهایانە لەروانینی جیاواز وفەرامۆشکارانەی بریتانییەکانەوە نەبوونە مایەی گرنگیپێدان، بۆیە جارێکی تریش بوونەوە هۆی سەرنەکەوتنی یەکجاریی دانووستاندنەکان. دووایی لە ٧/ ئابدا (لاودەردەیلّ) ی وەزیری رێپێدراوی فرەنسا، کە لەبارەی خاوبەرێوەچوونی دانووستاندنەکانەوە قسە بۆ سکرتێری کاروباری دەرەوەی ولاّتەکەی خۆی دەکات، دەلّێ: فرەنسییەکان خۆیان تاکلایەنانە داوای ئەم گفتوگۆیانەی

---

[114] Great Britain, Parliamentary Papers, Miscellaneous (22nd December, 1806), No. 1, p. 4.

هەرچی نامەگۆڕینەوە دیپلۆماتییەکانی سەردەمی دانوستاندنەکانی ئاشتی نێوانی فرەنسا وبریتانیا هەیە، جارێکی تر بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فرەنسی تۆمارکراونەتەوە، بۆبینینیان بروانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١-١٥٩

[115] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٥-٦٠.

ئاشتییەیان کردووە.[116] بەڵام (فۆکس) خۆی باش لەوە ئاگادارە، کە پێش ئەوەی وتارەکەی بۆناپارت بگات بە کۆمەڵگ، فۆکس خۆی هانی ئەوەیداوە ئاشتی لەگەڵ ئیمپراتۆری فرەنسادا بکرێ.[117]

راستیەکەش وایە، کە بریتانیا لەبارودۆخێکی هێندە نالەباردابوو، کە سەختتر بوو لەو بارودۆخەی لەپێش ئاشتیی ئەمیەن، کە بۆناپارتی تێدابوو. بەڵام لەبڕی بەپیرەوەچوونی ئاگربەستێکی وەك ئەوەی ئەمیەن، هەرچی دانووستاندن هەیە پەکیان کەوتبوو. ئەو هەڵوێستەی بریتانیا دەکرێ بەو دەربڕینە لاتینییە گوزارەی لێبکرێ، کە بە زۆری لەلایەن کەسە دانووستانکارە ئینگلیزییەکانەوە بەکاردەهێنرا (ئووتی پەوزیدایتییز– Uti Possidetis)، کە ماناکەی بە کوردی دەکاتە (ئەوەتا دانووستاندنت هەیە–بڕوانە ئینسایکلۆپیدیای بریتانی چاپی ٢٠٠٨–و). لەم بارەیەوە فرەنسییەکان تا مانگی ئاب نەیانتوانی چاویان بە چاوی بریتانییەکان بکەوێ ، ئیتر ئەوە بەباشی روون بۆوە، کە دانووستاندنی لەو شێوەیە بێکەڵکە.[118] کاتێك لە کۆتایی مانگی ئەیلولدا (لاودەردێل) داوای کرد پاسپۆرتەکەی خۆیی بدەنەوە، (تۆلیراند) وا لەم روداوە تێگەشت، کە ئیتر ئەوە کۆتایی دانووستاندنەکانە. لاودەردێل هەر پابەندبوو بەو هەستانەی خۆیەوە لەبارەی دیپلۆماسییەتەوە هەیبوون، (تێبینییەك) ی درێژی نارد بۆ وەزیری فرەنسی و باس لەوە دەکات، کە سەعادەتیان (سەعادەتی تۆلیراند) دەتوانێ وێنای چەند

---

[116] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٧١.

[117] لەیەکێك لە سەرنجراکێشترین نامە و پەیامەکانی ناو مێژووی دیپلۆماسیەتدا لە (٢٠/شوبات/١٨٠٦) دا فۆکس چیرۆکی پلانێکی هەڵبەستراو بۆ کوشتنی بۆناپارت بۆ تۆلیراند باسدەکات: دەڵێ پلاندانەرەکە داوای لە وەزیری دەرەوە کردووە جەماوەرێکی تایبەتی بداتێ، ئەویش بۆی جێبەجێ کردووە، پاشان قسە و باسێکی نهێنییان پێکەوە کردووە و ئیتر ئەو نهێنییە شوومەیان ئاشکرابووە. بۆیە فۆکس واباس لە خۆی دەکات، کە بە پلانی ئەم خراپەکارانە تووشی شۆك هاتووە و داوادەکات، کە بۆناپارت رەوانەی کەناردەریایەکی دوور لە فرەنسا بکەن بۆئەوەی ناسنامەی پلاندانەرەکە ئاشکرابێ، واش پیشان بدەن، کە فۆکس ئاگای لە هیچ نییە. لە وەڵامی ئەم پەیامە دۆستانە و دراماتیکییەدا بۆناپارت داوا لە (تۆلیراند) دەکات، کە بەناوی ئەوەوە سوپاسی (فۆکس) بکات.

هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢ و ٣ .

[118] هەڵوێستی بریتانیا لەبارەی ئەم دانوستاندنانەوە هەندێ وردتر لە(تێبینیی) یەکی (لاودەردێل) بۆ وەزیری کاروباری دەرەوە بەباشی باسلێکراوە، ئەو تێبینییە بە بەرواری (٧/ئاب/١٨٠٦) دا یە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٣–٧١. تەنها لەو تێبینییەدا شەش جار گوزارەی (ئووتی پەوزیدایتیین) هاتووە.

ئەستەمییەك بكات لەوەدا، كە بریتانیا وازی لە پرۆسەی ئاشتی هێناوە.[119] بەلام ئەگەر حكومەتی بریتانی سستیی نواند، یان خاو هەڵسووڕا لە سافكردنی مێشكی خۆیدا، ئەوا (تۆلیراند) بڕیاری خۆیی داوە. لەپاش ئەمەوە ململانەی نێوانی ئەم دوو وڵاتە گەیشتە ئالۆزترین بارودۆخ.

لە ساڵانی نێوانی (١٨٠٢-١٨٠٦) دا حكومەتی بریتانیا هەندێ بەرەنگاریی بەرووی چالاكییەكانی بۆناپارت لە ئۆرووپا و رۆژهەڵاتی نزیكدا نواند، بەلام هیچ گوێیان بەوە نەدا، كە لەناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چی بەڕێوەدەچوو. حكومەتی هیندی، كە بە تەواوی بەرپرسیاری سیاسەتەكانی بریتانابوو لەو ناوچەیەی جیهاندا، بەبێ ئەوەی بەهانەیەكی روونی هەبووبێت فەرامۆشكار بوو. لە لاپەڕەیەكی پێشووتردا ئەوەمان پیشاندا، كە چۆن عاقڵانە رێگەی بە ئێران دا بخزێتە ناو باوەشی بۆناپارتەوە.

میسۆپۆتامیاش وەك ئەوەی، كە هێشتا گرنگییەكی ئەوتۆی لەناو كاروباری بریتانیادا بۆ ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرنەگرتبوو، لەسایەی بارودۆخیكدا بەڕێوەدەچوو، كە حكومەت خۆی مەبەستی نەبوو گۆڕانێكی ئەوتۆی تێدابكات. سولەیمانی گەورە، كە پاشای بەغدا و سەر بە بریتانییەكان بوو، لەساڵانی پێش سەركەوتنی بریتانیاش بەسەر بۆناپارتدا لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، خۆی فەرمانڕەوای راستەقینەی وڵاتەكە بوو، لەرۆژی (١٨٠٢/٨/٧) دا مرد. سەردەمێكی باری نائاسایی و ململانەی ناوخۆیی بەدوای ئەوەدا هات، (هارفەرد جۆنز)، كە تا ساڵی (١٨٠٧) وەك باڵوێزی بریتانیا لە بەغدا مابۆوە، خۆیی بینییەوە بە بارودۆخێكی نائاسایی و هەلومەرجێكی نائارام دەورە دراوە.

مەسەلەی عوممان تەواو جیاواز بوو لە مەسەلەكانی ئێران و توركیا، توركیا ناوچەی میسۆپۆتامیاشی لەبەردەستدابوو. ئیمامی عوممان هەرگیز حەزی بەوە نەبووە خۆی لە هاوپەیمانێتیكردن لەگەڵ دەسەڵاتە ئەورووپییەكاندا بپێچێت. وەك فەرمانڕەوایەكی بێلایەنیش بیروبڕوایەكی پەسەندی لەبارەی فرەنسا و بریتانیاوە هەبوو. ئەو دەیویست بازاڕەكانی خۆی بە كراوەیی لەبەردەم كاڵای هەردوو ئەو نەتەوەیەدا بهێڵێتەوە، هەروەها ئارەزووی ئەوەشی هەبوو كاڵای عوممانییش بە هەردوولایان بفرۆشێت، بواری ئەوەی دەدا یاسا سادەكەی ئابووریی (پێشچاوخستن و داوا- عەرز و تەڵەب) لە هەموو ئەم كایانەدا هەبێ و كاری پێبكرێ. چەند جار لەناو ناوچەی ئاوە هەرێمایەتییەكانی خۆیدا بازرگانە بریتانییەكانی لە پەلاماری كەشتییە چەكدارەكانی فرەنسا پاراستوە و

---

[119] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٥٢-١٥٤

پشتگیریی کردوون. بەڵام وەك باویش بووە لەلای، هەمیشە وەك ئەوەی گوێی بە داوای لەو شێوەیەی فرەنسییەکان نەداوە، ئەو داوایەی بریتانییەکانیشی رەت کردۆتەوە، کە فرەنسییەکان بە دوژمن لەقەڵەم بدات. ئەم مامەڵە دادپەروەرانەیە لەلای هەردوولای بریتانییەکان وفرەنسییەکان پەسەند نەبوو، پێش کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیش هەردوولایان هەوڵی ئەوەیان دابوو ئەو شێوازەی پێ بگۆڕن. یەکەمین هاوپەیمانێتیی، کە لەگەڵ بریتانییەکاندا لە ساڵی (١٧٩٨) دا ئمیزای کردبوو، لەوە نەدەچوو بەهایەکی وەهای هەبێ. بەڵام کە لە دوو ساڵی پاش ئەوەدا سوپا و دیپلۆماسییەتی بریتانیا لە رۆژهەڵات و رۆژئاوایشدا بەشێوەیەکی (سەروئاسایی – فەوقەلعادە) سەرکەوتووبوون، ئیتر ئیمامیش دەرفەتی هەلێکی تری لەبەردەستدا نەمایەوە، هەر دەبوو مل بە هەڕەشە ناوەرۆکدارەکانی (مالکۆلم) بدات. ئەوەبوو پەیماننامەکەی ساڵی(١٧٩٨) نوێکرایەوە، کە زۆر لە دژی بەرژەوەندییەکانی فرەنسا بوو.[120]

کە ئیمام پەیماننامەکەی پەسەندکردەوە، بە خواستی خۆی نەبوو. بۆیە بەلایشیەوە ئاسایی بوو، پەیڕەوی لە نەریتەکەی خۆی بکات و کەی ئەو هەڕەشەیەی لەسەر نەما، کە بە زۆر پەیماننامەکەی پێ ئیمزاکردووە، ئەویش وەك جاران هەڵسوکەوت بکاتەوە. بۆیە لەسەردەمی کاردانەوەدا، ئەو کاتەی، کە کاریگەریی بریتانیا لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگشتی لاواز بوو، ئەو زۆر سەربەخۆیانە هەڵسوکەوتی بەرامبەری فرەنسییەکان و بریتانییەکانیش کرد. زۆر عاقڵانە جوڵایەوە و هیچ هەوڵی ئەوەشی نەدا بەلای فرەنسییەکاندا بیشکێنێتەوە.

لەساڵی (١٨٠٣) دا بۆناپارت (دێکان) ی رەوانە ناوچەی رۆژهەڵات کرد بۆ سەرۆکاریکردنی کاروبارەکانی فرەنسا لەوناوچەیە و دێکان یەکێك بوو لە باشترین ژەنەراڵەکانی بۆناپارت خۆی.[121] دەبوو زانیاریی تەواو لەبارەی ئەوەوە کۆبکاتەوە، کە باروذۆخی بریتانیا لەناو هیندستاندا چۆنە و پەیوەندییان لەگەڵ میرەخۆجێییەکانی ئەوێدا چۆنە و رێگای ئەوەیش بدۆزێتەوە، کە چۆن پەلامارێکی سەرکەوتووانە بۆسەر هیندستان بە ئەنجام بگەیەنرێ.

لەپاش سەردانکردنێکی (پۆندیچێری–شارێکی باشووری هیندستانە– و) دێکان گەڕاوەتەوە مۆریشیۆس و بارەگای سەرەکیی خۆی لەوێ داناوە. هەر لەو دەمەدا

---

[120] بڕوانە سەرچاوەکەی پێشوو، لاپەڕە ٣٢.

[121] Prentout, op. cit., Passim.

بۆناپـارت (م. دی کاڤـەیناك) ی وەك یاریـدەدەری دێکـان ناردۆتـە نـاو (عوممـان) بـە ئومێدی ئەوەی بتوانێت لە (مەسقەت) ببێتە کۆنسلّی فرەنـسا. کاتێك، کـە (کاڤـەیناك) دەگاتە مەسقەت ئیمام لەوێ نابێـت و بـە هەنـدێ کـار چـووەتە دەرەوە، کـاتێکیش کـە ئیمام گەڕاوەتەوە، ئەو نزیکەی دە رۆژ بووە لەوێ بـووە. ئـەم کابرایـە زۆر چـالاك بـوو، چـەندان هاوڕێیـەتیی لەگـەڵ خـەڵکانی چـالاکی نـاوخۆی ئـەوێ پێکهێنـابوو. لـەو مـاوە کەمەیدا لەوە دەچوو ئومێدی سەرکەوتنێکی باشی بۆخۆی مسۆگەر کردبێ. بەڵام ئیمام وەك ئامـاژەدانێکی بـە سـەرقاڵبوونی خـۆی لەگـەڵ بریتانییەکانـدا بـەڕێزەوە بینینـی (کاڤەیناك) ی رەتکردەوە و ئەمیش بە دڵی شکاوەوە لـە نیـوەی شـەوی (١٣/ تـشرینی یەکەم/١٨٠٣) دا ملی دەریای گرت و رۆشتەوە.[١٢٢]

بەڵام سەرباری ئەوەش عوممانییەکان بەرامبـەر فرەنـسییەکان نادادپـەروەر نـەبوون، دیسانەوە بازاڕەکانیـان چـۆن بـۆ بریتانییـەکان کراوەبـوو، ئـاواش بـۆ فرەنـسییەکانیش کراوەبوون. بازرگانە عوممانییەکانیش خۆیان سەرپشك بوون لەوەی لـە کـام لایـان شـت دەکڕن. ئـەم سیاسـەتە سـەرنەکەوتنێکی دوولایەنـە بـوو بـۆ بریتانییـەکان، نـەك تـەنها لەبەرئەوەی ، کە پێچەوانەی ئەو هاوپەیمانێتییە خوازراوەی خۆیان بـوو لەگـەڵ ئیمامـدا هـەیانبوو، بـەڵکو لەبەرئـەوەش، کـە هـەلی وەك ئـەوەی بریتانییـەکانی دەدایـە فرەنسییەکانیش، کـە بـاری خۆیـان ببـەن و کـاڵای خۆیـان بفرۆشـن و _زۆربـەی ئـەو کاڵایانـەش ئەوانـەبوون، کـە هیـی بریتانییـەکان بـوون و ئـەوان دەسـتیان بەسـەردا گرتبوون_ و بە نرخی زۆر هەرزانیش دەیانفرۆشتنەوە. بە کڕینی ئەو کاڵا هەرزانبەهایانە هۆزە عووممانییـەکان بەشێوەیەك گەشـەیان کردبـوو، کە(لۆرد ڤالـەنتاینا) لـە نێوانی ساڵانی (١٨٠٢–١٨٠٦) دا سەردانی ئەو بەشـەی جیهـان دەکـات، ئـەوان بـە هاوپـەیمانی فرەنسا لە قەڵـەم دەدات. هـۆزی دەسـەڵاتداری (جەواسـم)، کـە (ڤالـەنتاینا پێیگوتـوون جـویزێرم) کـە لـە کـەنارەکانی کەنـداوەوە بـۆ بـاکووری عووممـان کـاری بـەهارات و داودەرمان فرۆشییان کـردووە، چـەندان چـالاکیی چـەتەیی دەریایـان لـەدژی بازرگـانیی بریتانییەکان ئەنجامداوە.

ڤالـەنتاینا دەڵـێ: "ئەمانـە لـەپاش دەستبەسـەرداگرتنی سیـستماتیکیی حکومـەتی بۆمبایـەوە سـەریان هەڵدا و بـوون بـە هێزێکـی دەریـایی گـەورە و بـەلای کەمـەوە ٣٥

[122] Miles, op. cit. , II, 299-301

کەشتیی قەبارە جیاوازیان هەبووە و هەریەکە لەم کەشتییانە توانای هەڵگرتنی ٥٠-٣٠٠ نەفەری هەبووە.[123]

زیانی بەرچاوی لەدەستچوونی ئیمتیازات و کاریگەریی بریتانیا نە لە ناوچەی میسۆپۆتامیاوە(میسۆپۆتامیا زاراوەیەکی مێژووییە، ناوە، بە مانای وڵاتی نێوانی دوو روبارەکەی دیجلە و فورات دێت-و) بوو، نە لە کەنداوی فارسیشەوە بوو، بەڵکو لەناو ئێران وتورکیاوە بوو. هەروەها ئاماژەشمان بەوەدا، کە چۆن لە کۆتایی ساڵی (١٨٠٦) دا لەناو ئەم دوو وڵاتەی ئێران وتورکیادا کاریگەریی و نفوزی فەرەنسا جێگەی کاریگەری و نفوزی بریتانیای گرتەوە. لەگەڵ سەرەتای ساڵی (١٨٠٧) دا و بە ماوەیەکی کەم لەپاش پەککەوتنی دانووستاندنەکانی ئاشتیی نێوانی بریتانیا و فەرەنسا بۆناپارت بڕیاریدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هەریەکەی تورکیا و ئێراندا بگۆڕێت بۆ هاوپەیمانێتیی دڵنیا، چونکە رەنگە ئەم هەنگاوەی ببێتە هۆی چالاککردنی هاوکاریی نێوانی وڵاتەکەی خۆی و ئەو دوو وڵاتە لە دژایەتیکردنی دوو دوژمنە سەرەکییەکەی خۆیدا، کە بریتی بوون لە بریتانیا و رووسیا. لە کۆتایی مانگی شووبات/ فێبریوەی ئەو ساڵەدا دانووستانکارە تورك و ئێرانیەکان لە وارشۆ و لە نزیکی بارەگای سەرەکیی بۆناپارتەوە چاوەڕوانییان دەکرد بۆ گرێدانی رێکەوتننامەیەك، کە کارایی بۆناپارتی لەو دوو وڵاتەدا دەگەیاندە لوتکە و هەروەها بە دووایین خاڵی وەرچەرخانی گرنگی پێدانی بۆناپارتیش دادەنرا لە تەواوی ناوچەکەدا بە گشتی.

لەسەرەدەمی دانووستاندنەکانی تریشدا فەرەنسا هەر جۆرە پەیوەندییەکی دیپلۆماتییانەی باش و خوازراوی لەگەڵ هەردوو وڵاتی ئێران و تورکیا و ناوچە داگیرکراوەکانی ئۆروپاشدا هەبوو. بەڵام هەریەکەی ئەم دوو وڵاتەیش هەلومەرجی

---

[123] (Anonymous) review of Lord Valentine's G. V., Voyages and travels, 1802-1806 (3 vols., London, 1809), the Quarterly Review (1809), II, 124.

ئەم پێداچوونەوە درێژە، کە لە لاپەڕە ٨٨ تا ١٢٦ دەگرێتەوە تێبینییەکی سەرنجڕاکێشی تێدایە لەبارەی رەوشی میسرەوە .چونکە ئەو پەلامارەی تورکەکان بردیانە سەر پورتوگالییەکانی ناو هیند سەرەتاکەی لە میسرەوە دەستی پێکرد، هەر لە میسریشەوە ئێمەیش کەوتینە بەر هەڕەشە، بۆیە هەرگیز گرنگیی ئەو وڵاتە بۆ خۆی فەرامۆش ناکات، بۆیە ئەگەر ئێمە بۆ خۆمان دەستی بەسەردانەگرین، ئەوان زووبێت یان درەنگ هەر دەبێ دەستی بەسەردا دەگرن. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٢٥ ئەم تێبینییە گرنگیدانی بریتانیامان بەم وڵاتە پیشان دەدات، بێگومان هەر ئەو گرنگیپێدانەیش بوو، وای بۆناپارت کرد، لە ناوچەی رۆژهەڵاتدا بکەوێتە جووڵە.

ئـالۆزیی تایبـەت بـە خۆیانیـان هـەبووە و دەکـرێ ئـەو ئالۆزییانـە بـەم شـێوەیەی لای خوارەوە گرووپ بکرێن:

| تورکیا | ئێران |
|---|---|
| لـەژێر هەژمـوونی ڕووسـیادا بـوو، بـەڵام هەژمەشەکەی زۆر مەترسیدار نەبوو | نائومێدانە لەژێر هەژمەشەی ڕووسیادابوو |
| دەیەویست چەند هەرێمێکی خۆی لە چنگی ڕووسیا دەربهێنێتەوە | دەیەویست چەند هەرێمێکی خۆی لە چنگی ڕووسیا دەربهێنێتەوە |
| پەیوەنـدییان بـە دیپلۆماسـیەتە کاریگەرەکانی فەرەنساوە هەبوو | پەیوەنـدییان بـە دیپلۆماسـیەتە کاریگەرەکانی فەرەنساوە هەبوو |
| دیپلۆماسـیەتێکی کاریگـەری بێلایەنـەی هەبوو | دیپلۆماسیەتێکی وابەستەی لاوازی هەبوو |
| بەشـێوەی ڕەسمـی و جـدی لەلایـەن بریتانیای مەزنەوە ڕەفزنەکرابۆوە | بەشـێوەی ڕەسمـی و جـدی لەلایـەن بریتانیای مەزنەوە ڕەفزکرابۆوە |
| تـازە پرۆسـەی فریـاگوزاریی بریتانیـای مـەزنی ئـەزموون کردبـوو لـە بەدەستهێنانەوەی میسر و سوریادا | هیچ فریاگوزارییەکی گرنگیی بریتانیا لە یادەوەرییدا نییە |
| پەیوەندیی بە دیپلۆماسیەتی بریتانیاوە هەبوو | گەمژانـە لەلایـەن دیپلۆماسـییەتی بریتانیاوە فەرامۆش کرابوو |

لە بەشی یەکەمی ساڵی (١٨٠٧) دا و لە دژی ئەو جۆرە شتانەی لە پشتەوەن، بە جیا دانووسـتاندن لەگـەڵ هەریەکـەی تورکیـا و ئێـران لەلایـەن فەرەنـساوە دەسـتی پێکـرا. لەبەرئەوەی خودی بۆناپارت زۆر سەرقاڵی کاروبارەکانی ناو (پروسیا و نەمسا) بـوو، لـە مـانگی مایـسدا (کـاولینکۆرت) بـە یارمـەتیی (لا روا) دانووسـتاندنیان لەگـەڵ (ئـەمین ئەفەندی) ی باڵوێزی تورك لە (دێنزیگ) دەست پێکـرد. لـەبارەی پرۆژەکـەی فەرەنـساوە بۆ دروستکردنی هاوپەیمانێتییەکی بەرگریکردن و پەلاماردان لە دژی هەریەکە لە ڕووسیا و بریتانیا، ئەمین ئەفەندی بەو شێوەیە وەڵامی فەرەنسییەکانی دایەوە، کـە لـەو ڕووەوە فرمانی تەواوی ئیستەنبوڵی لەبەردەستدایە و ناتوانێـت لێیـان لابـدات. هـیچ ڕێگەیـەکی

ئەوەی پێنەدرابوو هاوپەیمانێتی لەدژی بریتانیا دروست بکات، چونکە تورکیا لەگەڵیدا لەشەڕدا نەبوو. هەروەها لەبارەی رووسیاشەوە دەبوو هاوپەیمانێتیەکی بەرەنگاریکردن دروست بکات، بۆ سەردەمێکی کاتیی دیاریکراو، کە ماوەکەی تەنها سێ ساڵ بێت. ئەم پێشنیارە نەرێییانە زۆر لەوە کورتهێنتر بوون ، کە فرەنسا چاوەڕوانی دەکردن. هیچ سەرکێشییەکیش بەو پرەنسیپانەوە نەکرا، بۆیە لەسەرەتای مانگی حوزەیرانی ئەو ساڵەدا دانووستاندنەکان گەیشتنە کۆتاییەکی ناسەرکەوتوو.[١٢٤] بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدان بارەکە لەگەڵ ئێراندا تەواو جیاواز بوو.(میرزا موحەمەد رەزاخان- کە بە کورتی پێیدەگوترا محەمەد رەزا) ی دانووستانکاری ئێران دەبوو هاوپەیمانێتییەك بهێنێتەپێشەوە، کە بەتەواوی لەلایەن تارانەوە رەزامەندیی لەسەر درابێ. ئەم لەگەڵ (جۆبێرت) دا هاتە ئۆرووپا، جۆبێرتیش ئەو کەسەبوو، کە بۆ رێ خۆشکردن بۆ وەرگرتنی رەزامەندیی ئێران لەبارەی ئەو هاوپەیمانێتییەوە، لە بەرژەوەندیی حکومەتی فرەنسا چووبووە ئێران. لە رۆژی (٤/مایس/١٨٠٧) دا هاوپەیمانێتییە بەناوبانگەکەی (فینکنشتاین) لەلایەن (محەمەد رەزا) بە نوێنەرایەتیی شا و (مارتی-کە پاشتر بە دەك دی بەسانیۆ ناسرا) بە نوێنەرایەتی ئیمپراتۆر ئیمزا کرا. (فینکنشتاین) ئەو ناوەی لە هاوپەیمانێتییەکە نرا، ناوی قەڵایەکی جوانە لە شاری (ئۆسترادا) لە رۆژهەڵاتی پروسیا و لەوێ رێکەوتننامەکە ئیمزا کراوە. ئەم پەیماننامەی هاوپەیمانێتییە لە شانزە بەند پێکهاتووە، بۆ بەرەنگاریکردن و پەلاماردانیشە و لەدژی بریتانیای مەزنە. لە بەندی یەکەمیدا بەڵێنی ئاشتی و هاوڕێیەتی و هاوپەیمانێتی دراوە. لە بەندی دووەمدا بۆناپارت بەڵێنی ئەوەی داوە سەلامەتیی هەرێمە ئێرانییەکان بەو شێوەیەی کە خۆیان هەن، بپارێزێت. بەشەکانی تری پەیماننامەکە، بەتایبەتییش بەندی هەشت و دە و دوانزە بریتی بوون لە ناچارکردنی ئێران بەوەی ئاسانکاری و کۆمەکی چالاکانە پێشکەشی هەر جموجووڵێکی فرەنسا لەدژی هیندستان بکات.[١٢٥] بۆ

---

[124] Shupp, op. cit., 432-433

[125] Mowat, R. B. , The Diplomacy of Napoleon(London, 1924), 172; Kaye, op. cit. , I, 304. Fro Text of the Treaty, see Gardane, Alfred de, Mission du General Gardane en Perse (Paris, 1865),

ئەلفرێد کوڕی ئەو جەنەراڵە بوو، کە ئەرکەکەی ئەنجامداوە ) و هەروەها ماوەتیش پێیوایە، کە پەیماننامەیە لەرۆژی (٥/٧ مایس) دا ئیمزا کراوە و گاردان پێیوایە لە رۆژی (٥/٤ مایس) دا ئیمزا کراوە و بەڵام کایا تەنها لەسەر ساڵ و مانگەکە قسەی کردووە و پێیوایە، کە وابێ(مایس ١٨٠٧) بڕوانە ماوەت سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٧٢ ن.

پیادەکردنی تێرمەکانی پەیماننامەکە یەکسەر نێردراوێکی سەربازیی کارا رەوانەی ئێران کرا، کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ژەنەراڵ (گاردان) دا بوو (لا کۆمت مەتییۆ کلۆد دی گاردان). لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ژەنەراڵ گاردان و ستافەکەی، کە بریتی بوون لە حەفتا ئەفسەری ڕێپێدراو و ڕێپێنەدراو لە ئازەربایجان و کرماشان سەرقاڵی مەشق و ئامادەکردنی ژمارەیەکی زۆری سەربازی ئێرانی بوون.[١٢٦]

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٨٠٧) دا ئێران بە تەواوی هاوپەیمانی بۆناپارت بوو، لە دژی روسیا و بریتانیای مەزن بوو، ژمارەیەکی زۆری شاندی سوپای فرەنسی لەسەر خاکی ئێرانی سەرقاڵی مەشقپێکردنی سەربازە خۆجێییە ئێرانییەکان بوون. هەر لەو دەمانەدا پەیماننامە ئەنگلۆ- عووممانییەکەی ساڵی (١٨٠٠) بەناو مابۆوە، بەلام لەڕووی کردەییەوە بە تەواوی فەرامۆشکرابوو، دیسانەوە بازاڕەکانی عوممان کەوتبوونەوە بەر سێلاوی کالا بریتانییە دەستبەسەردا گیراوەکان. هەرچی کەنداوی فارسیشە بەهۆی چالاکیی روو لە زیادی چەتەکانی خێڵی جەواسمەوە بارودۆخێکی ناجێگیری هەبوو بۆ بازرگانە بریتانییەکان. لەگەڵ مردنی سولەیمان پاشای بەغدا دا لە ساڵی (١٨٠٢) دا کۆنسڵی بریتانیاش خۆیی لەو هەلومەرجە سەخت و نادڵنیایەی میسۆپۆتامیادا بینییەوە، کە تا ساڵی (١٨٠٧) و پاشتریش بەو ناڵەبارییەوە بەردەوام بوو.

تورکیا ئەگەرچی ملیشی بەوە نەدەدا خۆی بدات بە دەستی بۆناپارتەوە، ئەوەندەی، کە دۆست و هاوڕێی بۆناپارت بوو، هێندە هاوڕێی بریتانیای مەزن نەبوو. وەك بالادەستترین نەتەوەی زاڵی ناو ناوچەی رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست، فرەنسا توانیی جێگەی بریتانیا بگرێتەوە. جارێکی تریش وەك مەترسییەکی چاوەڕوانکراو بۆسەر هیندستان دەرکەوتەوە. ئیتر وەختی ئەوەبوو بریتانیا دووەمین سەرکەوتنی خۆی و یەکجارەکیترین سەرکەوتن بەسەر بۆناپارتدا بەدەستبهێنێتەوە. ئەوەبوو لە دووساڵی پاشتردا سەرلەنوێ زاڵبوونەوەی یەکجاریی خۆیانیان لەناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا چەسپاندەوە.

---

[126] Curzon, op. cit., I, 577.

### ٢. دووەمین و دوایین سەرکەوتنی بریتانیا بەسەر نا پلیۆندا ١٨٠٨-١٨٠٩

ئەوەی شایانی باسە، لە ماوەی رۆژگاری تشرینی یەکەمی (١٨٠٦) بۆ مانگی مایسی (١٨٠٧) واتە لەماوەی نێوانی سەرنەکەوتنی دانووستاندنە ئەنگلۆ - فرەنسییەکانی ئاشتی و گرێدانی هاوپەیمانێتییەکی فرانکۆ-ئێرانی لە فینکنشتاین، خاڵێکی دیار و بەرچاوی ناو زەمینەی ململانەی مێژوویی نێوانی بریتانیای مەزن و بۆناپارت پێکدەهێنێ. هەر تۆزێك پێش ئێستە ئاماژەمان بەوەدا کە کاریگەریی بۆناپارت لەناوچەی رۆژهەڵاتدا لەو دەمانەدا دەگەیشتە لوتکەی خۆی. باش ئاگادارین، کە لە رۆژئاواشدا دەسەڵات و ئیمتیازاتەکانی هەر بەرەو ژوور و بەرەو زۆری هەڵدەکشان.

لەئۆکتۆبەری ساڵی (١٨٠٦) دا لە (جینا و هەروەها لە فرێدلاند) یش سەرکەوتنێکی یەکلاییکەرەوەی بەسەر پروسییەکاندا بەدەستهێنا. لێرەوە ئیتر نزیکەی هەموو ئۆرووپا کەوتبوونە بەر دەسەڵاتی ئەو. تەنها بریتانیا مابوو، ئەویش بەهۆی دابڕاویی شوێنەکەیەوە(یان بەهۆی دەمارگیریی خۆیەوە) نەکەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی رەوە سەربازەکانی ئەوەوە. ئەویش بۆ ملکەچپێکردنی ئەم دورگە سەرسەختەی (دوکاندارەکان) پەنای بردە بەر (سیستمی کیشوەری)، کە سیستمێکی بەناوبانگە و بەپێی مەرسوومی بەرلین، لە تشرینی دووەمی (١٨٠٦) دا دارێژراوە. بەم پێیە بارێکی گەمارۆیان بەسەر دوورگە بریتانییەکاندا راگەیاند و هیچ بارهەڵگرێکی بریتانی لەناو هیچ کام لە دوورگە فرەنسی و دورگە هاوپەیمانەکانی فرەنساشدا رێگەی هاتوچۆی پێنەدەدرا. ئەو مەرسوومە جارێك لە کانوونی دووەمی (١٨٠٧) و جارێکی تریش لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا تەواو کراوە. ئیتر بریتانیای مەزنیش زیاد لە هەرکاتێکی تر ناچار بوو بە دەنگ (داواکارییەکانی ئەنجومەن) ی خۆیەوە بچێت، کە لە (کانوونی دووەم تا تشرینی دووەمی ١٨٠٧) دەرچووبوون و ئەمانیش هێندەی مەرسومەکەی فرەنسا گرنگ بوون و داوایان دەکرد لەگەڵ ناپلیۆندا شتەکان یەکلایی بکاتەوە. ئەمانیش هاتن گەمارۆیەکی لەوەی سەرخۆیان توندتریان راگەیاند بیسەپێنن بەسەر فرەنسا و هاوپەیمانەکانی و ئەوانەشی پشتان پێدەبەستن. لەمە بەدوواوە ململانە ئەنگلۆ- بۆناپارتییەکان بە تەواوی بوون بە ململانەیەکی بازرگانی و وڵاتانی پشت دەریایش تا دەهات دەکەوتنە گەرداوی ئەو رکەبەرییانەوە بەدوای ئەمانەدا هاتن.

رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك خۆی گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو بۆ بریتانیا، بەڵام گرنگییەکی زۆر گەورەی ستراتیجییانەی هەبوو لەبارەی سەلامەتیی موڵکەکانیانەوە لە

هیندستان و بەسەلامەت بەڕێوەچوونی بازرگانییەکانیان لە ڕۆژهەلات بەگشتی. بۆیە لەبەر چەند بەهایەکی ناوخۆیی و نیشتمانی دەبوو حکومەتی هیندستان سیاسەتێکی چالاکانە لەبارەی ئەو بەشەی جیهانەوە بگرێتەبەر.

(سێر جۆرج بارلۆ-١٨٠٥) کە لە فەرمانڕەواییکردنی هینددا بەدوای (لۆرد ویلزلی) دا هات و لەسەردەمی فەرمانڕەواییکردنی ئەودا کاریگەرییەکانی بریتانیا لەناو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا پەیدابوون، لەلایەن (لۆرد مینتۆ-١٨٠٧-١٨١٣) جێگەی پێگیرایەوە. لەناو کەسە دیارەکانی یارمەتیدەرانی منتۆدا (بریگادێر ژەنەراڵ- واتە عەمید-جۆن مالکۆڵم) هەبوو، کە (لەسەرەتاوە کاپتن بوو، پاشان بوو بە سێر)(١٧٦٩-١٨٣٣) توانیبووی هەریەکەی ئێران و عوومان بهێنێتە ریزی بریتانیاوە و وایان لێبکات لەدژی فرەنسا بن.[127] لە کاتی کاردانەوەکەدا ئەم کابرایە ئاگاداری کاروباری ناو ئێران بوو، هەروەها رەخنەی لەوەش هەبوو، کە سیاسەتی دەرەوەی حکومەتەکەی هیندستان زۆر خامۆشە. ئەم فەرمانڕەوا نوێیە لەسەرەتاوە لەوەدەچوو بتوانێت خۆشییەکی کەم بداتە مالکۆڵم، چونکە مالکۆڵم زۆر لەوە نیگەران بوو، بەتەنگ ئەوەوە بوو چۆن بتوانن بە زوویی چالاکیی خۆیان بەرامبەری ئێران و شوێنەکانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بگرنەبەر. بۆیە دەبینین لە نامەیەکی تایبەتدا، کە بە بەرواری (١٠/تشرینی دووەم/١٨٠٧) ئاراستەی کۆلۆنێل (کلۆز) ی کردووە، باسی لە نیگەرانییەکانی خۆی کردووە:(خۆت دەزانیت، کە پلانگێڕییەکانی فرەنسا لەناو گۆڕەپانی ئێراندا نیگەرانییەکی قووڵی بۆ سەر هۆشی لۆرد مینتۆ دروستکردووە و ئەویش منی لەیادە بۆ ئەو شوێنە دامبمەزرێنێت، لەوانەیە تۆش پێتوابێت، کە لەم بارەوە من هەندێك دوودڵم، بەلام بەپێی ئەو شتانەی لەم دواییانەدا لە بەنگاڵ بیستومە، ئەو "واتە لۆرد مینتۆ- و"پتر لەوەی کابرایەکی سەخت و بوێر بێت، کەسێکی نەرم و بەرهەستە و وادەزانم بەوشتانەیش، کە ئێمە هەمانە قایل دەبێ و هەڵپە بۆ باری ئاسایشی تر ناکات، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو بارانەی تر باجی خۆیانیان ببێت و ئەویش لە یەکەم بینینەوە وا هەست بکات ئەو شتەی، کە دەبێ لەبەرامبەری ئەو باجەدا وەریبگرین خراپەیەکی ئەرێیی بێ)[128]

---

[127] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە لاپەڕە ٣٤-٣٨.

[128] دەقی نامەکە لەناو کتێبەکەی کایادایە، ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە، لاپەڕەکانی ٣٩١-٣٩٤ هەروەها ئەو ژیاننامەیەش، کە کایا بۆ مالکۆڵمی نوسیوە بۆ ئەم باسەی ئێمە زۆر گرنگە، وشەیەك، کەپێویست بکات◄◄

هەرچەندە مالکۆلم پێشوەخت دەیزانی ئەم فەرمانڕەوا نوێیە لێبڕاوانە هەمان ئەو سیاسەتە لەبەرچاو دەگرێ، کە بەجێگیری بانگەشەی بۆ دەکرد. لە هەولێکیشیدا بۆ قایل کردنی لۆرد مینتۆ بە روانینەکانی خۆی، مالکۆلم لە (١٨٠٧/١١/٢٣) دا راپۆرتێکی دیار و باشی ئامادەکرد. بۆ ئامادەکردنی ئەم یاداشتەی پشتی بە یاداشتێك بەستبوو، کە لەلایەن (کاپتن پازلی) یەوە ئامادەکرابوو، بەناوی (فریاگوزاریی مالکۆلم) ەوە، ئەم کاپتنە ماوەی نزیکەی چوار ساڵ لە ئێران کاری کردبوو.

بەپێی نووسراوی ناو یاداشتەکە سەرکەوتنی پێشبینیکراوی بۆناپارت بەسەر روسیادا_ئەگەرچی هێشتا مالکۆلم ئەوەشی نەبیستبوو ئەو سەرکەوتنە روویدابێ_ بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە رۆژهەلاتدا بە خراپی دەخاتە ژێر مەترسییەوە. ئەو ئیمپراتۆریا مەزنەی عوسمانی دەکەوێتە ژێر قەڵەمڕەوی فەرمانی بۆناپارتەوە. ناوچە ئاشووبەکانی وەك میسر و سوریا و بەغدا دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی فرەنساوە و ئینجا دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بکەیت هیندستانیش بکەوێتە بەر مەترسیی خراپەوە.

هەلومەرجی ئێران، کە بەپێی یاداشتەکە (لەم رووداوانەدا یەکلاییەکرەوە دەبێت) زۆر لەوەوە دوورە هەلومەرجێکی نائومێدانە بێت. شا زۆر لەوە بەئاگابوو، کە بریتانیا پایەیەکی بنچینەیی هەیە لەناو رۆژهەلاتدا. شا پاش ئەوەی لەوە نائومێد بووبوو بریتانیا لە شەڕی دژ بە رووسیەدا کۆمەکی پێبکات پەنای بۆ بۆناپارت بردبوو کەوتبووە دوای. بۆیە دەبوو بریتانیا بەپەلە شاندێك بنێرێت بۆ ئێران، بۆئەوەی شا تێبگەیەنێت، کە واباشترە بۆ ئەو، کە خۆی بداتەوە پاڵ بریتانیا. خۆ ئەگەر هاتوو قایلیش نەبوو بەو پێشنیارانەی نێردراوەکان بۆیدەکەن، ئەوا پێویستە هەڕەشەی لێبکرێت و ئەو هەنگاوانەی لە بەرامبەریدا دەگیرێنەبەر، نەك هەر تەنها کاریگەری دەخاتە سەر

---

◄◄ لێرەدا بیڵێین ئەوەیە، کە سێر جۆن، و، کایا (١٨١٤ – ١٨٧٦) زانیارییەکی باشی هەبووە لەبارەی کاروبارەکانی هیند و بریتانیاوە, بۆ ساڵانی (١٨٣٢– ١٨٤٥) ئەم کایایە ئەگەرچی وەك مێژوونوسێکی سەربازی ناسراوە، بەلام خۆی نوسەرێکی باشی بواری مەدەنییش بووە، دەتوانیت لەم رووەوە بڕوانیتە ئەم سەرچاوەیە(Dictionary of National Biography, X, 1141-1142) لەناو سەرچاوەی پێشویشدا لاپەڕەکانی ٨٤٨–٨٥٦ کە کورتەیەکی باشیشی تێدایە لەبارەی ژیاننامەکەی مالکۆلمیشەوە، لە کۆتاییەکەشیدا ئەم ڕاگەیاندنە هەیە، کە دەڵێ: هەوو نامە بەلگەکانی مالکۆلم لەبەردەستی کایادابوون بۆیە زانیارییەکانی ئەو لەبارەی ژیانیەوە تەواو و تێروتەسەل بووە. بۆیە کە کایا ئەو شتانەی دیسان بەرهەم هێناوەتەوە، سودێ:ی زۆری هەبووە، بە تایبەتییش بۆ ئەم کارەی ئێستای ئێمە.

ناوبانگەکەی، "بەڵکو ئاژاوە دەخەنە ناو هەموو کاروبارەکانیەوە و گریمانێکی زۆری ئەوەش هەیە بە دروستکردنی شۆڕش و هەلگەڕانەوەیەك کۆتایی بە دەسەلاتەکەی بهێنن."[129] بۆ گەیاندنی ئەم پەیامە بوێرانەیە (لۆرد مینتۆ) هات (مالکۆلم) ی راسپارد بەخێرایی بە سەرۆکایەتیی شاندێك بۆلای شا، بگاتە کەنداوی فارس.

بەشێوەیەکی کاتی و وەك دەستپێکێك لەلای ئەمانەوە، حکومەتی ولاتەکە (بریتانیا) (سێر هارفەرد جۆنز) ی کۆنسلی پێشووی بریتانیای لە بەغدا وەك نێردراوێکی سەروو ئاسایی (فەوقەلعادە) نارد بۆ تاران و دەسەلاتی تەواوی پێدا بۆ ئەوەی بتوانێت لە بەرژەوەندیی تاجی پاشایی دانووستاندنی هاوپەیمانێتییەك لەگەڵ شای ئێراندا دەست پێبکات. گەیشتنی (جۆنز) بە بۆمبای لەو کاتەدا، کە دەبوو دەستبداتە ئەو کارەی نەخشەی بۆکێشابوو، بووە مایەی سەرسووڕمانێکی ناپەسەند بەلای حکومەتی هیندستانەوە. ئەم بەناو کرابوو بە هاوەڵی پاشکۆی لۆرد مینتۆ ، کە دەبوو وەك نێردراوێکی سەروئاسایی تاجی پاشایی بچێت بۆ تاران و حسابێك بۆ ئەو ئەرکەش نەکات، کە لەلایەن (مالکۆلم) ەوە دانرابوو.[130] لەم رووەوە قسەوباسکردن و لێکتێگەیشتن لەنێوانی حکومەتی نیشتمانی و بەرپرسیارانی ناو هیندستاندا هەبوو. بەلام کەسێك، کە لەم مەسەلەیەدا بێزار بوو، بریتی بوو لە مالکۆلم، لەبەرئەوەی بەلایەوە ئەستەم بوو، لەناو ئەو بوارەدا، کە بە کێلگەی کارکردنی دیپلۆماتییانەی خۆیی دەزانی بەرگەی ئەوەبگرێ، رکەبەرێکی تری بۆ دابنرێ.

لۆرد مینتۆ زۆر ئاگایانە بەپیری گرفتەکەوە چوو، هەوڵیدەدا لەناو ئەو بارودۆخە شپرزەیەدا باشترین دەستکەوتی هەبێ. لەو دەمەدا، کە دەبوو بەرەو ئێران بکەوێتەڕێ (٩/ئازار/١٨٠٨) هەندێ رێنمایی درێژی بۆ مالکۆلم نووسی و ئاشکراکرد. بۆ مالکۆلمی بەهەڵپەی نووسیبوو:" تۆ دەتوانی هەموو ئەو جۆر و بڕی یارمەتییانەمان بۆ دابین بکەیت کە ئەرکەکەمانی لەسەر رادەوەستێ، بەپێی روانینی من بۆئەم بارودۆخانە، نەیاریکردنی ئێمە بۆ فرەنسا لەناو ئێراندا ئەو کەنارەیە، کە ئاواتەکانی ئێمەی تێدا دەگەن بە ئاکام.........." بۆچوونێکی هاوشێوەی ئەوانەی مالکۆلم لەناو رێنماییەکانی ئەمیشدا هاتبوو" بۆدەرکردنی دوژمن بە کەمترین گریمانی دواخستنەوە" پێویستمان بە

---

[129] دەقی ئەم یاداشتە لەناو سەرچاوەکەی کایادا هەیە، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٣٩٥- ٣٩٨.

[130] Aitchison, op. cit., XII, 8-9

جوولاندنی هێزەکان دەبێ لە ئایندەدا. مینتۆ لەسەر قسەکانی دەڕوا و دەڵێ: "من زۆر ئارەزوو دەکەم باسکی تۆ بەهێز بکەین و کاریگەریی گونجاویش بخەینە سەر بیری ئەو کەسانەی تۆ دەچیتەلایان، هەروەها منیش زۆر لەگەڵ ئەوەدام، کە بەپێی ئەوەی خۆت دەچیتە عەقڵتەوە و پێت باشە ژمارەی یاوەرە پاسەوانەکانت بۆ زیادبکرێ (لەبەرئەوەی بە نهێنی ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم) ددان بەوەدا دەنێم، کە سێر هارفەرد جۆنز شەڵتاخێکە لەناو ئەم یارییەی ئێمەدا" مینتۆ بوونی متمانەی تەواوی خۆیی لەسەر ئەوە دەبڕیوە، کە "مالکۆلم کەسێکی بە تەحەمولی کارساز و ئیدارییە" و دەتوانێ هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو هەڵوێستە قورس و سەختانەدا بکات، کە لەوانەیە لە ئەنجامی ئەو ئەرکەوە سەرهەڵبدەن، کە بە (هارفەرد جۆنز) سپێردراوە.[١٣١]

مالکۆلم بەخێرایی ملی ڕێگەی گرت بەرەو ئەوشتەی، کە بەڕاستی دووەمین ئەرك بوو ئەوی پێڕاسپێردرێ بۆ ئێران. ئامانجی ئەرکەکەی بریتی بوو لەوەی ئەو کاریگەری و نفوزەی فرەنسا هەیەتی لەئێراندا بە نفوزێکی بریتانی جێگەکەی بگیرێتەوە. هەر زوویش دەرکەوت، کە مالکۆلمی بە زەبروزەنگ بۆ ئەم ئەرکە گونجاو نییە، ئەوەبوو لەگەڵ پۆلێك ستافی بەتواناداا لە مانگی مایسی (١٨٠٨) دا گەیشتە کەناری ئێران. بەرپرسیارانی ئێران زۆر لە دوواین هەڵوێستەکانی بێزار بوون. بۆیە ڕێگەی پێنەدرا بکات بە پایتەخت و لەبریی پایتەخت پێیانووت بچێت گرفتەکەی خۆی لەگەڵ پارێزگاری ناوخۆیی (فارس) دا باس بکات. سەرکەوتنیشی لەوکاتەدا ئومێدێکی ئەوتۆی نەبوو. بە بێزاری و هەڕەشەکرنەوە گەڕایەوە بۆ هیندستان و ئەو ئەرکەشی بۆی چووبو، گەیشتە ئاکامێکی ناسەرکەوتوو.[١٣٢]

ئیتر (سێر هارفەرد جۆنز) کە ئاکامی ئەرکەکەی لەلایەن هەریەکەی مالکۆلم و بەرپرسە خەرجیدابینکارەکەی خۆی (لۆرد مینتۆ) وە سەرکۆنە کرا، دەبوو چارەسەری باروودۆخەکە بکات. (ئەو ڕێنماییانەی) کە لەلایەن حکومەتی هیندستانەوە دەرکرابوون

---

[131] بۆبینینی دەقی تەواوی ئەم پەیامە بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Kaye, op. cit., I, 409-411

[132] Ibid, 306. A Punitive expedition to occupy the Island of Kharak was prepared by Lord Minto, but failed to materialize. Ibid, 307.

بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەو دووەمین ئەرکەی بە مالکۆلم سپێردرابوو بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەشی ١٥، لاپەڕە ٣٩٩-٤٥٦

بۆ دواخستنی ئەرکەکەی زۆر درەنگ گەیشتبوونە دەستی.[133] زۆر گومانیش لەبارەی ئەوەوە هەیە، کە توانیبێتیان لەکاتدا ئەو پەیامە بگەیەننە دەستی. لە دەوروبەری پایزی سالّی (١٨٠٨) دا جارێکی تر جۆنز لە تاران بوو، هانی شای دەدا بۆئەوەی مل بە ئیمزاکردنی پەیماننامەیەك بدات، کە بە تەواوی بە سەرکەوتن بۆ بریتانیا لە قەلّەم دەدرا. ئینجارەیان بارودۆخەکە لە بارودۆخی چەند مانگی پێشووتر لەبارتربوو.

بەلّێنە قەبەو گەورەکانی (گاردان) بۆئەوەی کۆمەکی ئێران بکەن لەشەڕی دژی رووسیادا نە ئەوەیان تێدامابوو قەناعەت بە شای نائومێد بکەن و نە دەشیانتوانی ئارامیشی بکەنەوە. هەرچی بۆناپارتی بێویژدانیشە هات لەڕۆژی (٩/ تەمموز/١٨٠٧) دا و لەگەلّ قەیسەری رووسیادا پەیماننامەی (تیلزیت) ی ئیمزا کرد و ئەوەبوو لە ناوەڕاستی هاوینی سالّی (١٨٠٨) دا داخوازییەکانی ئێرانیش بەگشتی فەرامۆشکران. ناپلیۆنیش لەبەرئەوەی لە ئیسپانیا نارەزاییەکی جەماوەری لەدژی فەرمانڕەواییکردنی پەیدابوبو، سوك و ئاسان وازی لەوەی پلانەی خۆی هێنا، کە وایدانابوو لەدژی هیندستان کردەی سەربازیی فراوانخوازی ئەنجام بدات.[134] لەبریی دوژمنە سەرسەختەکەی جاران روسیا بۆ فرەنسا بوو بە هاوپەیمانێکی گەورە، وەك کاردانەوەی ئەمەش ئێرانیش وازلێهێنرا بۆئەوەی بە دەستی دوژمنکارییەکانی رووسیاوە بکاتە دواچارەنووسی خۆی.

بەدیوێکی تردا بریتانیای مەزن دوژمنێکی چالاکی رووسیا بوو، هەرچی پەیوەندیی دیپلۆماتییانەی نێوانیشیان هەیە لە سالّی (١٨٠٧) دا پچڕێنرابوو. لەم کاتانەدا جۆنز توانیبووی لە شا نزیك بکەوێتەوە و بەم بۆنەیەشەوە شا کاتی تەواوی لەبەردەستدابوو تەرخانی بکات بۆئەوەی لەم گۆڕانە گەورانە تێبگات. ئەم بارودۆخە زۆر لەباربوو بۆ سەرهەلّدانی لەیەکترگەیشتنی نێوانی بریتانیا وئێران و توانای پڕ سەلیقەی جۆنزیش توانی سوود لەم بارودۆخانە وەربگرێ. ئەوەبوو بە نوێنەرایەتیی (شا جۆرجی سێیەم) ئەلّماسێکی گرانبەها پێشکەشی شا کرا و دلّنیابوون لەهێنانەپێشەوەی رێکەوتننامەیەکی خێرا و درێژخایەن.

لە مارسی سالّی (١٨٠٩) دا بەرپرسیارانی ئێران قایل بوون بە پرۆژەکەی جۆنز بۆ گرێدانی هاوپەیمانێتییەکی (ئەنگلۆ- ئێرانی) لەگەلّ کۆمەکێکی دارایی سالآنە، کە برەکەی (١٢٠,٠٠٠) پاوەندی ئیستەرلینی بێت و بریتانیا بیدات بە شای ئێران. ئەوەبوو

---

133 Aitchison, op. cit., XII, 9.
134 Fournier, A., Napoleon I (London, 1914), PP. 49-51

جۆرێك لە شەڕكردن لەنێوانی بریتانیای مەزن و رووسیادا پەیدابوو. نیگەرانی گەیشتبووە ئاستێك، كە كاتێك نەبوو پەیوەندی و مشتومڕكردن لەگەڵ بەرپرسانی ناو هیندستان یان بریتانیا رابوەستێ، جۆنزیش لەلای خۆیەوە عاقڵانە هەڵسوكەوتی لەم هەلومەرجەدا كرد. ئەوەبوو بە زوویی (هاوپەیمانێتیێكی بەرایی و هاوڕێیەتی و هاوپەیمانێتیی لەنێوانی بریتانیای مەزن و ئێراندا) دروستكرد. بەپێی ئەمەش (هەرچی هاوپەیمانێتی و لێكتێگەیشتنێكی تری نێوانی ئێران و دەسەڵاتەكانی ناو ئۆروپا هەبوو لەلایەن شاوە هەڵوەشێنرایەوە.) بەڵكو لەوەش زیاتر شا بەوەش رازی بوو، كە لەمەودووا رێگە نەدرێ (هیچ هێزێكی ئەوروپی، سەر بە هەرشوێنێك بێت بەناو ئێراندا، یان بەرەو هیندستان، یان بەرەو بەندەرەكانی وڵاتەكە بڕوات)(بەندی سێیەم)[135] دیارە هەموو ئەو بەڵێنانەشی جۆنز لە گەڕانەوەكەیدا وەریگرت بەڵێنی ئەوەبوو، كە ئەگەر ئێران لەلایەن هەر وڵاتێكی ئەوروپییەوە داگیركرا، ئەوا بریتانیا هێزێكی بۆ ئەنێرێت ، یان لەبریی هێز كۆمەكی دارایی و زەخیرەی جەنگیی بۆ دەنێرێت.(بەندی چوارەم)[136] بەڵام بەرهەرحاڵ ئەم بەڵێنە سادەیەش دەبوو بە پەیماننامەیەكی جێگیر رێكبخرێت. ئەم پەیماننامەیەش دەبوو پاشتر لەنێوانی هەردوو وڵاتەكەدا رێكبخرێ. ئەم هاوپەیمانێتییە بەگشتی دەبوو لەڕۆژی پەسەندكردنەكەیەوە (واتە ١٢/مارت/١٨٠٩) كاری پێبكرێ و هێزی خۆی وەربگرێ.

كاتێك لۆرد مینتۆ لە دوائاكامی هاوپەیمانێتییە بەراییەكەی ئاگادار كراوە، وا هەستیكرد، كە سوكایەتیی پێكراوە و بەگشتییش سوكایەتییەكەی لەلایەن جۆنزەوە پێكراوە، چونكە خۆی وایدەزانی پێش ئەوەی دەست بداتە ئەم سەرقاڵییە گەورەیەی خۆی، راوێژ و پرسی بە جێگری پادشا كردبێ. لەمەوە بەدواداچوونی راستەقینە لەلای هەریەكەی حكومەتی هیندستان و نیشتماندا دروست بوو، چونكە دەبوو حكومەتەكەی هیندستان ئەو كۆمەكە داراییە بۆ شا دابین بكات، بۆیە پێدەچوو تەواوی پەیوەستەكە

---

[135] Ibid, 47. A synopsis of this article is inaccurately made in Hertslet's Persian Treaties, etc., P.4:"
رێگە بە هیچ هێزێكی ئەوروپی نەدرێ بەناو ئێران، یان هیندستان، یان بەندەرەكانی هیندستاندا تێپەڕبێ"

[136] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٤٦–٤٩. دەقی پەیماننامەكەش هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕەكانی ٤٦–٤٩. هەروەها بڕوانە (British and Foreign Papers) بەرگی یەكەم، بەشی یەكەم، لاپەڕەكانی ٢٥٨–٢٦١.

گەیشتبێتە سەر کەناری هەرەسهێنان. بەو پێیەیش، کە لۆرد مینتۆ راسپێردرابوو سەرپەرشتیی تەواوی رێکەوتنی هاوپەیمانێتییەکە بکات، ئەم پێیوابوو، کە گرنگێتیی ئەو هاوپەیمانێتی کردنە لەپێناوی دابینکردنی باری ئاسایشی هیندستاندایە.[137] بە روانینی مینتۆ، وەك هەر پسپۆرێکی چاودێر ئەو هاوپەیمانێتیکردنە لێدانێکی کوشندە بووە بۆ کاریگەریی فەرەنسا لەناو ئێراندا. تا بەهاری ساڵی (١٨٠٩) هەرچی ئەفسەر و دیپلۆمات و هاوڵاتیانی فەرەنسی لەناو ئێراندا بوون دەرکران. ئەرکە بەناوبانگەکەی (ژەنەراڵ گاردان) یش بە ناکاملی کۆتایی پێهێنرا و ژەنەراڵ خۆی و ستافەکەشی پاسپۆرتەکانیان درایەوە دەستیان و رەوانەی نیشتمانی خۆیان کرانەوە.[138]

بەلای بۆناپارتی خۆپەرستەوە کەسێك ، کە لەم پاشەکشە کردنە راستەقینەیە بەرپرس بێت، هەرکەسێك بێت گرفت نییە، گرنگ ئەوەیە، کە خۆی نییە. هەرگیز لەوە نەدەچوو گەیشتبێتە ئەو قەناعەتەی، کە هاوپەیمانێتیکردنەکەی (فینکنشتاین)، کە بەپێی ئەم بوو ئەرکەکەی گاردان لەناو ئێراندا دەستی پێکرد، بەگشتی بەهۆی گرێدانی هاوپەیمانێتییەکەی (تیلزیت) ەوە پەکیخرابێ، لەبەرئەوەی ئەمەی تیلزیت شای لەبەر بەزەیی و رەحمەتی رووسیادا بەجێهێشت. بە تەواوی بەهۆی ئەو شێوە کەسایەتییەوە کە ئەو هەیبوو، باشیش پێیوەیەی دەناسرایەوە، لەوەناچێ تەنانەت لەو کاتەشدا کە هاتنەدیی خەونەکەی بووبوو بە پەرچوو، ئومێدی ئەوەی لەدەستدابێ کە وەك مولکێکی خۆی دەست بەسەر ئێراندا بگرێ. لە نامەیەکیدا، کە بە بەرواری (٢٠/ئاب١٨٠٩/Schonbrunn) نووسراوە، فەرمانی بە وەزیری کاروباری دەرەوە( The Comte de Champagny) ی خۆی کردووە کە نامەیەکی دلدانەوە و ئاشتیخوازانە بنێرێ بۆ شا و پێی بلێت: " تێیدا دەلێیت": کە من سەرکۆنەی ژەنەراڵ گاردانم کردووە و لێیشی نارازی بووم، لەبەرئەوەی گۆرەپانی کارکردنەکەی خۆیی بەجێهێشتووە بۆیە من داوام لە بەرپرسی کاروبارەکانی دەرەوەی خۆم کردووە، کە بگەرێتەوە بۆ پایتەختەکەی، تا ئەو کاتەی خۆم بە زوویی باڵوێزێکی تری بۆ رەوانە دەکەم.

بۆیە نامەکەی ناپلیۆن بە روونی تێمدەگەیەنێت، کە بە کەسەر و ناسۆرەوە لەو هۆکارە تێدەگات، کە شای ناچارکردووە سەرلەنوێ پەیوەندیی کاتی و هەڵبەستراو

---

[137] Kaye, op. cit., I, 307-308

[138] بۆ بینینی روانینە واقعییەکانی مینتۆ لەبارەی ئەم هاوپەیمانێتییەوە بروانە ئەم سەرچاوەیەی کە لای خوارەوە ناوی براوە، لاپەرەکانی ٨٧–٨٨ و هەروەها لەبارەی نیگەرانییەکانی گاردانیشەوە بروانە کتێبەکەی کایا، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، لاپەرەکانی ٣٠٤–٣٠٥ .

لەگەڵ ئینگلیزدا دەست پێبکاتەوە......من ئارەزوو دەکەم سەرلەنوێ پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێراندا بچێنمەوە، لەبەرئەوەی من بەهایەکی زۆر گرنگ بۆ ئەوان دادەنێم.[139]

ئەمە هەوڵێکی نەزۆکانە بوو لەلایەن بۆناپارتەوە درا، بۆ مەرگی کاریگەرییەکانی خۆی، نەك هەر تەنها لە ئێراندا، بەڵکو لە رۆژهەڵاتیشدا بەگشتی، چونکە ئامازەکانی ئەو مەرگە بەهۆی پەیماننامەکەی (تیلزیت) دەرکەوتبوون. تەنانەت لەپێش بە ئاکام گەیشتنی ئەو هاوپەیمانێتییەشەوە بریتانیا هەوڵی خۆیی دابوو بۆئەوەی گوشارێك بخاتەسەر ئاستانە. لە سەردەمێکی زووی هەر ئەو ساڵەشدا هێزە دەریاییەکانی بریتانیا لە دەورویەری ئیستەنبوڵەوە دەرکەوتبوون و خۆیانیان پیشاندابوو، بۆئەوەی سوڵتان بترسێنن و وای لێ بکەن، کە زۆر گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی فرەنسا نەگرێت.[140] بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دەستپێشخەرییەش شکستی خوارد و پێدەچێت تورکەکان هەستیان بەوە کردبێ، کە بریتانییەکان کێشەکەیان زۆر بە جدی وەرگرتبێ. بۆیە لە دانووستاندنەکانی مانگی مایس و حوزەیرانی خۆیاندا لەگەڵ فرەنسییەکان، تورکەکان وەك هەموو جارێکیان وایان پێشاندا سوورن لەسەر ئەوەی بە تەریبی تەنها لەگەڵ پێشنیارەکانی بۆناپارتدا بەرێوەبچن، هێندەی ئەو پێشنیارانە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا رێك دێنەوە.[141] بێ متمانەیی ئەمان بە بۆناپارت بە بەستنی هاوپەیمانێتییەکەی (تیلزیت) سەریهەڵدا و زۆربوو. زۆر کارامەییانە، بۆئەوەی بەئاشکرا تورکەکان بفرۆشێتەوە بە تزاری رووسیا، ئیمپراتۆری فرەنسا پێشنیاری ئەوەی کرد، کە میانەکاریی نێوانی رووسیا و تورکیا بکات بۆ گەلالەکردنی ئاشتییەکی (رووسی– تورکی) لە بەشە نهێنییەکەی ئەم پەیماننامەیەدا، رەزامەندیی لەسەر ئەوەش وەرگیرابوو، کە ئەگەر ئەو هەوڵانەی ئاشتی بە ئاکام نەگەیشتن، ئەوا، ئەوا بواری ئەوە سازبدرێ، کە تزاری رووسیا بەوشێوەیەی خۆی پێیخۆش بوو، راستەوخۆ دانووستاندن لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بکات.[142]

بەلام تورکەکان نە ئامادەیی ئەوەیان تێدابوو واز لەو ترسانەی خۆیان بهێنن، کە لە رووسیا هەیانبوو، نە حەزیشیان لەوەبوو خاو و خلیچك دابنیشن چاوەڕوانی ئاکامی ئەو رێکەوتننامە سەرنجراکێشەی نێوانی بۆناپارت و دوژمنە کۆنەکەی خۆیان بکەن. دەکرێ

[139] Lloyd, Lady Mary, New Letters of Napoleon I omitted from the edition published under the auspices of Napoleon III- from the French- (London, 1898), 153-154.
[140] Shupp, op. cit., 427-428.

[141] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، لاپەرەکانی ٥٢–٥٤.
[142] Cambridge Modern History, IX, 398.

کاردانەوەی ڕاستەقینەی ئەمان بەئاسانی لە ناو ئەو هەڵوێستەی (ئەمین ئەفەندی) دا ببینرێت، کە لەناو دانووستاندنەکانی خۆیان لەگەڵ فرەنسییەکاندا لە مانگی(مایس و حوزەیران) دا پیشانیدا. ئەگەرچی بە بەڵگەوە رووسیای مەزن دڵی زیاتر بۆ ئیمپراتۆرە بەهەڵپەکە(واتە بۆناپارت–و) لێیدەدا، نەك بۆ تورکیایەکی لاواز ، یان ئێرانێکی تەمومژاوی، یان ئەم دوو هاوبەشە پێکەوە. دیارە ئەو ڕێکەوتنە درێژخایەنەی بۆناپارت لەگەڵ رووسیادا کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر تورکەکان داناوە، ئەگەرچی بەگشتی زانیارییەکیشیان لەبارەی ئەوەوە نەبوو، کە بەشە نهێنییەکەی ڕێکەوتننامەکەی نێوانیان چیی تێدایە. بەدڵنیاییەوە لەلای ئەمان لە (تیلزیت) ئەو خەسڵەتە بەراییەی خۆیی لە دەستدابوو، کە وەك هاوڕێیەکی بڕواپێکراو بمێنێتەوە، بەتایبیش لەبەرئەوەی لە سەردەمێکدا ددانی بە دژایەتیکردنی رووسیادا نابوو. بە دیوێکی تریشدا بەلای رووسیاوە بریتانیای مەزن بووبوو بە هێزێکی ناپەسەند، بەتایبەتییش لەبەرئەوەی بریتانیا دوژمنایەتیی بۆناپارتی دەکرد. ئیتر ئەوەبوو لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٠٧) دا تزار پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی خۆیانی لەگەڵ بریتانیای مەزندا بڕی، ئەگەرچی تزار خۆی ئەوەشی بەدڵ نەبوو، بەڵام دەیەویست بناغەی هاوپەیمانێتییەکی نوێ و بەهێز لەگەڵ تورکیادا دابنێ.

کێشەکە ئاڵۆز و گرێچن بوو، بۆیە بریتانیای مەزن ماوەی یەك ساڵی پێویست بوو بۆئەوەی بتوانێت تورکیا بەشێوەیەکی فەرمی بەلای خۆیدا رابکێشێت.[١٤٣]

"هاوپەیمانێتییەکی ئاشتی و بازرگانی لەنێوانی بریتانیای مەزن و ئاستانەی باڵادەستدا لە ڕۆژی ١٨٠٩/١/٥ لە دەردەنیل بەئاکام گەیەندرا." لە دیباجەکەیدا هاتووە، کە"سەرباری دەرکەوتنی هەڵە لەیەکتر تێگەیشتنیش لەنێوانی کۆشکی پادشایی بریتانیای مەزن و ئاستانەی باڵادەستی عوسمانیدا لەبارەی رووداوەکانی سەردەمەکەوە، هەردوولایان وەك یەك ئارەزوویەکی دڵسۆزانەیان هەیە بۆ

---

[143] لە هەوڵیدا بۆ لەبەرچاوگرتنی سیاسەتێکی بونیادنەرانە بەرامبەر بە تورکیا، بەدواداچوونی جدییانە ساڵی (١٨٠٨) لە پەرلەماندا دەستی پێکرد و کەوتنە تاوتوێکردنی هۆکاری تێکشکانی پەیوەندییەکانی بریتانیا لەماوەی ئەو چەند ساڵە کەمەی رابوردوودا. لەم بەدواداچوونانەدا زانیاریی ورد و تەواو لەبارەی ئەو پەیوەندییانەوە تاوتوێکران لەگەڵ گوشار و پەستانی سیاسەتەکانی فرەنسا لەسەر – هەردوولایان, لەماوەی ساڵانی (١٨٠٠–١٨٠٨) دا و لەوانەیە باسی ئەو گوشارانەش بابەتی سەرەکی و بەرچاوی ناو ئەو تاوتوێکردنانە بوبن. بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Parliamentary Debates (1808), X, 497-534.

زیندووکردنەوەی هاوڕێیەتییە دێرینەکەی نێوانیان" و ڕازی بوون بەو هاوپەیمانێتییەی لەبەردەستیاندابوو. ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکەیان لە بەندی چوارەمدا بەرجەستە کراوە، کە تێیدا هاتووە هەموو هاوپەیمانێتیی و ئیمتیازاتەکان بە بەردەوامی پێداچوونەوە و چاکسازییان تێدا دەکرێ وەك ئەوەی هەرگیز لەوەوپێش نەوەستابێتن و پەکیان نەکەوتبێ.[144] ئەم ڕێکەوتنە و دانەیەکی تریشیان هەیە کە تا ئێستا گرنگترینیانن و شایانی ئەوەن ئێستا باسیان لێوەبکەین و کاریگەرییەکی گەورەیان هەبووە نەك هەر لەسەر گەشەکردنی نفوزی بریتانیا لە میسۆپۆتامیادا_کە دەبوو لەماوەی بیست ساڵێکدا بکەوێتە ژێر قەڵەمڕەوی گریمانەیی فەرمانڕەوایی ئیستەنبوڵەوە_ بەڵکو لە پەیوەندی لەگەڵ کاریگەری و نفوزی بریتانیا لە تەواوی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بەگشتی.

ناوەڕۆکی دووەمین ڕێکەوتنی نێوانیان هەر لە ناونیشانەکەشیەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ناوەڕۆکەکەی بکەین، کە بریتییە لە :"پەیماننامە و بەندەکانی ئاشتیی نێوانی بریتانیای مەزن و ئیمپراتۆریای عوسمانی، بەو شێوەیەی ڕەزامەندییان لەسەر وەرگیراوە و لە قۆناغ و سەردەمی جیاوازدا تێکەڵکراون، یان ئاڵوگۆڕیان پێکراوە، لەسەرەتاوە و لە ساڵی "١٦٧٥"ەوە دەستیان پێکراوە و پاشتریش هەموویان جەختیان لەسەر کراوەتەوە بەو پەیماننامەیەی ئاشتیی ساڵی "١٨٠٩" لە دەردەنیلّ".[145] بەمشێوەیە و وەك تەواوکارییەك بۆئەوەی پێش خۆی، ئەم ڕێکەوتننامەیە گرنگترینی ناو هەردووکیانە، یەکێکیشە لە کاملترین و دیارترینی بەڵگەکانی ئەم جۆرە پەیوەندییانە.

بەپێی بەندی یەکەمی، بریتانییەکان ئازادیی تەواوی بازرگانیکردن لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانی و هاتوچۆپێکردنی کاڵای بازرگانییان بەناو ئیمپراتۆریاکەدا وەرگرت ولەپاڵیشیەوە بەڵێنی پاراستنی سەلامەتیشیان وەرگرت. ئەم بەڵێنەش زۆر بە ڕوونی لە بەندی بیست و سێیەمدا تۆمارکراوە. ئەم بەڵگەیە گومانێکی لەوەدا نەهێشتۆتەوە کە چ نەتەوەیەك زۆر پەسەند و خوازراو بووە لەلای ئاستانە. بۆنمونە

---

[144] بڕوانە:
British and Foreign state papers, vol. I, pt. I, 770.و
هەروەها بۆ دەقی پەیماننامەکەی نێوانیشیان بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٧٦٨- ٧٧٣.

[145] دەقەکەی لەم سەرچاوانەی خوارەوەدا هەیە:
Hertslet, Lewis, Commercial Treaties, II, 346-369;
·British and Foreign State papers, Vol. I, pt. I, 747-766.

دەبوو بازرگانە فلامینگییەکان ئەو دەمەی لەناو هەرێمی ئیمپراتۆریای عوسمانیدابن ئاڵای بریتانی بەرزبکەنەوە، نەك فرەنسی. وەك ئاماژەیەکیش بۆ ئەمە بەندی سی و سێ بە ووشەی دەربڕ و مانادار دەڵێ:" بە لەبەرچاوگرتنی ناوەڕۆکی ئەم هاوپەیمانێتییەی ئێستە، باڵوێز یان کونسڵی فرەنسی بۆی نییە لێرە بەدواوە نەیاریی خۆی دەربڕێ یان لێرەوە دەست لە شتەکان وەربدات" بەو دیویشدا بریتانییەکانیش لەلای خۆیانەوە، بەڵێنیان دا بەپێی نەریتە کۆنەکە رێژەی ٣٪ بەهای ئەو کاڵایانەی خۆیان، کە وەك گومرگ دەیانهێنن ، یان رەسمی هاتوچۆ بدەنە بەرپرسیارە عوسمانییەکان(بەندی ٣٤).

بە کورتی لە ساڵی(١٨٠٩) دا بریتانیا لە پەیوەندی لەگەڵ تورکیادا سەرکەوتوتر و باشتر بوو لە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئێراندا. ئەگەرچی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عوممانـدا بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش جیاواز بوو. ئێمە باسمان لەوەکرد کەلە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٨٠٣) دا لەلایەن (م. دی. کاڤەیناك)ەوە هەوڵێك درا بۆئەوەی ببێتە کونسڵی فرەنسا لە مەسقەت و لەلایەن ئیمامیشەوە هەوڵەکەی پەکخرا. [١٤٦] ئیتر ئاڵوگۆڕی دیپلۆماتییانەش لەگەڵ فرەنسادا تا ساڵی (١٨٠٧) دەستی پێنەکردەوە، لەو ساڵەدا ئیمام سەعید نێردراوێکی خۆیی نارده مۆریشییۆس بۆئەوەی بتوانێت لەدژی دوژمنە گەورەکانی خۆی (واتە وەهابییەکان) هەندێ فریاگوزاری وەربگرێ. بە دیوێکدا وەهابییەکان و بەدیوەکەی تریشدا چەتەکان، بەتایبەتیش چەتەکانی هۆزەکانی جەواسم، بووبوونە گەورەترین سەرچاوەی مەترسی بۆسەر عوممان. هەر هەوڵێکیش کە لە دەوروبەری ساڵانی (١٨٠٣ تا ١٨٠٦) ئیمام دابووی بۆئەوەی لەدژی ئەم سەرچاوە سەرەکییانەی مەترسی بۆسەر عوممان هەر جۆرە فریاگوزارییەکی لەلایەن بریتانییەکانەوە پێبکرێ شکستی خوارد، بۆیە بە ناچاریی بایدایەوە بەلای فرەنسییەکاندا. لەبەرئەوەی لە مانگی ئازاری (١٨٠٧) دا لەپاش ئیمام بەدرەوە هاتبووە سەر حوکم، ئیمام سەعید بە پەلە ئەو نێردراوەی باسمان کرد ناردیە لای فرەنسییەکان. ئیتر هەر بەزوویی و لە رۆژی (٥/ حوزەیران/١٨٠٧) دا هاوپەیمانێتییەك لەنێوانی ئیمام سەعید و ژەنەراڵ دێکاندا پێکهێنرا. بەڵام لە مانگی تەمووزی ساڵی(١٨٠٨) دا بە گرێدانی پەیماننامەیەکی بەهێزتری هاوپەیمانێتی ئەمەیان هەڵوەشێنرایەوە و بەپێی ئەم تازەیەش (م. داڵۆنز) وەك بریکاری کونسڵ نێردرایە مەسقەت.[١٤٧]

---

[146] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٥٠-٥١.

[147] Miles, op. cit., II, 310-311.

ئەوەی کە ئیمامی پاڵپێوەنا بۆ ئەم هاوپیمانێتییە بێئومێدبوونی لە بریتانییەکان و ئەوە نەبوو، کە هیوای بە فەرەنسییەکان هەبێ، بۆیە ئەستەم بوو سودێکی لێیەوە دەست بکەوێ. هیندی بریتانی بۆئەو باشتربوو لە مۆریشیۆسی فەرەنسی. بۆیە هیچ وەهمێکی لەو بارەیەوە نەبوو، کە کاتێك وڵاتەکەی بە سەختی دەکەوێتە ژێر گوشار، لەنێوانی ئەم دوو لایەنە رکەبەرەدا داوای یارمەتیی کاریگەر لە کام لایان بکات. بەڵام هێشتا بریتانیا بۆئەوە هەڵنەبژێردرابوو، کە هیچ جۆرە کۆمەکێکی لەو شێوەیە پێشکەش بکات، بەتایبەتییش لەبەرئەوەی ئەو کاتە عوومان کەوتە بەر ئەگەری مەینەتی و مەترسی، ئەوان (واتە بریتانییەکان) ئامادە نەبوون بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە رۆژهەڵات بخەنە بەر مەترسییەوە. بۆ دڵنیاییش، کاتێك، کە چەتەگەرییەکەی جەواسمەکان لەدژی بازرگانیکردنەکەی ئەوان زیادی کرد، هاتن دوو کەشتیی جەنگییان لە ناوچەی (رەئس موسەندەم) دانا، کە دەکەوێتە کەناری باکووری عوومانەوە. بۆئەوەی کاری فریاگوزاریی ئیمام ئەنجام بدەن، لەوکاتدا، کە ئیمام سەرقاڵی بەگژداچوونەوەی ئەم چەتە مەترسیدارانە بوو. ئەم فریاگوزارییە بە بەراورد لەگەڵ گەورەیی ئەو کارەیاندا کە دەبوو بیکەن زۆر بێبەها بوو. بۆیە تەواوی خۆسەرقاڵکردنەکە هەر وەك سوکایەتیکردنێك وابوو.

بریتانییەکان لە سالانی (١٨٠٨ – ١٨٠٩) زۆر سەرقاڵی گیروگرفتە گەورەو بەرچاوەکانی عوسمانییەکان و ئێران و هیندستان بوون، بۆیە بواری ئەوەیان نەبوو گرنگییەکی جدی بدەنە عوومان و کەنداوی فارس. ئەوەبوو لە پایزی ساڵی (١٨٠٩) دا هەموو ئەم گیروگرفتانە بەشێوەیەکی پەسەند چارەسەر بوون. لە تورکیا و هەروەها لە ئێرانیش ئەوە یەکلایی بووەوە ، کەسەرکەوتن و هەڵکشانی بریتانییەکان بەسەر فەرەنسییەکاندا بە باشی جێگیر بوو و دامەزرا. لە هیندیش چەند رێوشوێنێکی سیاسییانەی گرنگی یەکلاییکەرەوە گیرانەبەر.

لە (٢٥ ی نیسان و ١٧ ی حوزەیران و ٢٢ی ئاب) ی هەمان ساڵدا چەند پەیماننامەیەکی هاورێیەتی لە لایەن حکومەتی هیندی لەلایەك و هەریەکەی (راجای لاهور و پاشای کابول و میرەکانی سیند) لە لاکانی ترەوە گرێدرا.[١٤٨] بۆیە ئیتر حکومەتی هیندی کەوتە هەڵوێستێك، کە دەیتوانی لە نزیکەوە گرنگی بداتە کاروبارەکانی عوممان و کەنداوی فارس و تەنانەت بە هەند وەرگرتنی نالەباریی

---

[148] British and Foreign State Papers, Vol. I, Pt. I, 266-268.

بارودۆخەکەی ئەوێش بە پێویست لە قەڵەم بدات. ئەم کێشەیەش زۆر ئاسان بوو. عوومەمان تازە سەرسەختانە و بەتووندی لەلایەن وەهابییە بەهێزەکانەوە پەلامار درابوو لەوانەش بوو لە کۆتاییدا تەواوی وڵاتەکە داگیربکەن. داگیرکارییەکی لەو شێوەیەش بەشێوەیەکی زۆر ترسناك بۆ سەر بەرژەوەندیی بریتانییەکان لە کەنداوی فارسدا مەترسیدار دەبوو، چونکە وەهابییەکان سەرسەختانە دوژمنایەتیی هەموو ئەوانەیان دەکرد، کە بیروبڕوا ئاینییەکانی ئەوانیان بە دڵ نەبوو.[١٤٩] بۆیە پارێزگاریکردن لە ئیمامی عوومەمان بۆ بریتانیا پێویست بوو. ئەگەرچی لەو سەردەمە زووەدا بریتانیا بەرژەوەندییەکی وای لەو مەسەلەیەدا نەبوو، زۆر شایان بێت. لە مانگی ئەیلولی ساڵی (١٨٠٩) دا کە چەتەکانی جەواسمەکان بەبەردەوامی لە گەشەدابوون لەدژی عوومەمانییەکان و هەروەها بازرگانییەکەی بریتانیاش، حکومەتی هیندی دەستپێشخەرییەکی باشی بۆ دژایەتیکردنی چەتەکان کرد، بەڵام نەیشیتوانی درێژەی پێبدات و تەواوی بکات. دوو فەرقاتەی گەورە و نۆ کەشتیی راوەدوونانی نارد، کە فەوجی شەست وپێنجەمینیان هەڵگرتبوو، لەگەڵ بەشێك لە فەوجی (٤٧) هەم و نزیکەی هەزار سەربازی خۆماڵی بەرەوە کەنداوی فارس ملی دەریایان گرت. فەرمان بۆ ئەم نێردراوانە دەرکرا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم دەستەیە بێورە و ناکۆك بوون لەناو خۆیاندا، ئەو ئەرکەشی پێیان سپێردرابوو تەواو نەکرا و بێبەرهەم بوو، یان ئەنجامەکەیان هێندە کەم بوو، کە سوودێکیان لێ نەبینرا.[١٥٠]

---

[149] وەهابییەکان رەوتێکی پیوریتانیی موسڵمانە و لەلایەن (موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب-١٧٠٣-١٧٩١) ەوە دۆزراوەتەوە، بیروبڕوای سەرەکییان ئەوەیە، کە دەبێ ئیسلام لە هەموو ئەو کارو کردەوە و سروتە نا سەلەفییانە پاك بکرێتەوە، کە لەلایەن چەند وەچەی ئەو خەڵکانەوە هێنراونەتە ناویەوە، کە گوێیان بە رەوشت و هەڵسوکەوتی ئاینەکەیان نەداوە. تەنها قورئان و رەوشت و فەرموودەکانی (موحەمەد)ی پێغەمبەر بەرپرس و بابەتی سەرەکین لەم ئاینەدا و دەبێ بە توندی و وەك خۆیان پەیڕەوییان لێبکەین. لە ساڵانی سەرەتای دەرکەوتنیاندا وەهابییەکان بەرامبەر بە خەڵکە نا موسڵمانەکان و تەنانەت موسڵمانە موعتەزیلەکانیش زۆر توند بوون. (دۆزەرەوەی ئەم رەوتە یارمەتیی بەردەوامی لە موحەمەد بن سعودی دامەزرێنەری بنەماڵەی سعودی عەرەبییەوە پێگەیشتووە) ئەم دوو بزوتنەوەیەش پێکەوە بە رێنماییپێدان و بە شەڕکردن توانییان بڵاوببنەوە تا ئەوەتا وەك ئێستا (ئێستای کاتی چاپە ئینگلیزییەکە-١٩٤١-و) دەبینی دەستیان بەسەر تەواوی نوورگەی عەرەبیدا گرتووە.

[150] Miles, op. cit., 143-145.

ئەم نێردراوانە، چەند باش بوو، هێندەش بەخەرجی بوو، تێچوونی زۆربوو. بەڵام دەبێ بەدڵی ئەو چەتانە بووبێ، کە خۆیان بۆ لێدانیان چووبوون، بەڵام لێدانەکەیان بنەبڕ نەبوو.[151] هەروەها دەبێ بە دڵی عووممان و دەوڵەتە بێکەڵکەکانی تری عەرەبی کەنداویش بووبێ، لەبەرئەوەی ئەوانیش ناتوانن هەست بەوە نەکەن، کە ئەو هێزە نێردراوە ئاماژەیە بۆ بوونی دەسەڵاتێکی قەببە لەناوچەکەدا. بەدیوێکی تریشدا ئەمە نواندنی یەکەمین هەوڵی راستەقینەی بەشەکەی حکومەتی هیندی بوو بۆ بەگژداچوونەوەی چەتەگەریی ناو کەنداو. بەگژداچوونەوەی چەتەگەرییش "وەك لە بەشی داهاتوودا لێیدەکۆڵینەوە" دەبێتە بەهانەی بەرایی بۆ دامەزراندنی نفوزێکی بریتانی لەو ناوچەیەدا. تا ئەم کاتەش کەنداو نەبووبووە بابەتێکی سەرەکیی راستەوخۆ ئیمپریالیزم یان سیاسەت و هەر شتێکی تری بریتانی.

هەموو ئەو پێوانانەی زووی بریتانیا بۆئەم ناوچەیەی دانابوو، کە هەندێکیشیان گەورە بوون، هەر بۆئەوە بوون مەبەستێکی دیاریکراو بپێکن، کە بریتی بووە لە زاڵبوون بەسەر پورتوگالییەکان و هۆڵەندییەکان لەناوچەکەدا، یان مەبەستێکی بچووکتر لەوە، کە بریتی بووە لە رکەبەریکردن لەگەڵ فرەنسییەکاندا. زاڵبوونی راستەوخۆ و بەردەوامی بریتانییەکان بەسەر کەنداوی فارسدا نزیکەی دەساڵ پاش ئەوە دەبێ دەستی پێکردبێ.[152]

وەك ئەوەی لە پەیوەندییەکانی تەك میسۆپۆتامیادا هیچ شتێکی گرنگ و تایبەت لە سالانی(١٨٠٨-١٨٠٩) دا دەرنەکەوت، بەڵام کاتێك، کە مالکۆلم لە ساڵی (١٨٠٨) دا بۆ دووەمین ئەرکی خۆی چووە دەرەوە، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا چاوێکیشی لەسەر پەیوەندییەکانی نێوانی بریتانیا و بەغدایش بێت. لۆرد مینتۆ ئەمی دامەزراند و (نامەی متمانەپێبەخشینی) پێدا بۆلای هەردوو پاشای ئێران و پاشای بەغدا.[153] بەڵام وەك ئاماژەمان پێدا تەواوی ئەو ئەرکەی کە بۆی چووبوو شکستی خوارد. تاکە شتێك لێرەدا، کە وەك روداوێکی گرنگ شایانی باسکردن بێت، ئەوەبوو لە ساڵی (١٨٠٨) دا (کلاودیۆس جەیمس ریچ) وەك کونسلی بەغدا دەستنیشان کرا و جێگەی (سێر هارفەرد جۆنز) ی گرتەوە. ئەم کابرایە دیپلۆماتێکی بەتوانا بوو، بۆماوەی دەساڵ بەکارترین

[151] Coupland, op. cit., 143-145.

[152] بڕوانە سەرچاوەی خوارەوە، لاپەڕەکانی ٧٤-٧٦.

[153] Kaye, op. cit. , I, 409n.

نوێنەری ڕۆژئاوابوو لەناو بەغدادا.[154] شایانی تێبینیکردن و باسە، کە سەرکەوتنەکەشی نە لەسەر بناغەی ڕەزامەندی و لێکتێگەیشتنی هاوبەش بوو، نە ئەنجامی کارکردنەکەشی شتی وای لێکەوتەوە. بەڵکو وەك هەموو جارێك لەسەر بناغەی ئەو مەیلەبوو لەو دەمەدا پاشای بەغدا بەرەو بریتانیا هەیبوو. بەدڵنیاییش هەر ئەو پاشا شەڕانییە بوو، کە مانەوەی ریچی لە بەغدادا گەیاندە ئەو ماوە درێژە چاوەڕواننەکراوە. کاریگەری و نفوزی ڕاستەوخۆ و بەردەوامی بریتانیا لەناو میسۆپۆتامیادا بە دوو دەیە(هەر یەك دەیە بەمانای دە ساڵ–و) پاش ئەوە دەستی پێکرد.

بە دەربڕینێکی تر، یەکەمین سەرەتاکانی زاڵبوونی بریتانیا بەسەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، نە لەمیانەی میسۆپۆتامیاوەبوو، نە لەناوچەی کەنداوی فارسەوە. یەکەمین دامەزرانەکەی لەناو ئێرانەوە بوو، لەسەر بناغەی "هاوپەیمانێتییەکی بەراییەوە" بوو، کە لە ساڵی (١٨٠٩) دا سازکرا. بەناو و بە کردەوەو کاریگەرییش، ئەم هاوپەیمانێتییە بە چەند ساڵێکی کەمی پاش گرێدانەکەیەوە سازکرایەوە، بەهێز و فراوانکرایەوە. کاریگەریی بریتانیا لەهەریەکەی هیندستان و تورکیادا، کە دووبنکەی سەرەکیی ڕوانین بوون بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵات، لە یەك کاتدا بەشێوەیەکی بەرچاو باش بوو. لە هیندستان چەند پەیماننامەی هاوڕێیەتی لەگەڵ فەرمانڕەوا میللییە بەکارەکاندا گرێدرا، هەڵوێستی گشتیی بریتانیا لەو ناوچە بەرفراوانەدا، زیاد لە هەر کاتێکی تر ئارام تر و ئاسایشتر بوو.

لەتورکیاش بەپێی (پەیماننامەی ئاشتی) و پەیماننامە گرنگ و بەرچاوەکانی ساڵی (١٨٠٩) بریتانیا وەك پەسەندترین وڵات و باڵادەسترینیان ناسرا و توانیشیان تا کۆتایی ئەو سەدەیە ئەو بارودۆخەیان لەوێ دەست پێوەبگرن.

[154] Longrigg, op. cit., 255.

## ناوبـــــــری ١٨١٠- ١٨٣٠

لەدووەمین و سێیەمین دەیەی سەدەی نۆزدەدا، بریتانییەکان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕووبەڕووی هیچ جۆرە ڕکەبەرییـەکی بەرچـاو نەبوونـەوە. هەرچـی ڕکەبـەریی فرەنسییەکان هەبوو، لەنێوان ساڵانی (١٨٠٩-١٨١٠) دا بەهۆی دژە هێرشی بریتانیەکان بۆسەر فرەنسییەکان و بۆسەر بنکەی هۆڵەندییەکانی پشتی فرەنسییەکانیش لە ناوچەی (سەری ئومێدی باش)ەوە تا سیلان خامۆشکرانەوە. تا دەوروربـەری سـاڵی (١٨٣٠)یـش ڕکەبەریی ڕووسیەکانیش لەڕاستیدا شتێکی ئەوتۆ نەبوو شایانی باس بێت.[١٥٥] لە مـاوەی بیست ساڵدا بریتانییەکان دەسەڵاتی خۆیانیان بەسەر ئێراندا بەهێزکرد و دەستیان دایـە ئەوەی کەنداوی فارسیش بخەنە ژێـر قەڵـەمڕەوی خۆیانـەوە. لـە میـسۆپۆتامیاش ڕۆڵـی پاشا بواری بۆ ڕۆلگێڕانی سوڵتان خۆش کرد و وڵاتەکەش بەتـەواوەتی بۆئـەوە ئامـادە و سازکرا تا بریتانیا بە تەواوی ئامبازی ببێت.

### ١. بەهێزبوون و بەرفراوانبوونی کاریگەریی بریتانیا

لۆرد مینتۆی فەرمانڕەوای گشتیی هیندستان، کە نە حەزی لە ئەرکەکـەی (هارفـەرد جـۆنز) بـوو بـۆ ئێـران و نـە لـە سەرەتاشـەوە ڕێکەوتنـە بەراییەکـەی دەسـەلماند، زوو گەیشتە ئەو قەناعەتەی بەسوودبوونی ئـەم سـەرقاڵییانە بسەلمێنێت و ئاکامەکانیـشیان پەسـەند بکـات.[١٥٦] بۆیـە لـە نامەیەکیـدا، کـە لـە بـەرواری تـەمموزی (١٨٠٩) بـۆ جـۆن ماڵکۆڵمی ناردووە، پێیگوتـووە:"بـە لەبەرچـاوگرتنی ئـەو سـەرقاڵییانە، ئێـران وازی لـە

---

[155] جیاواز لـە شـشوێنگرتنەوەی کاریگـەریی و نفـوزی فرەنـسییەکان لـەناو ئێرانـدا، بریتانیـا تـوانیی لەساڵی(١٨١٠)دا دەست بـە سـەر دورگـە گرنگەکـەی مۆریـشیۆسدا بگرێـت و"چـالاکییە بێزارکارەکـانی فرەنساش لەناو دەریاکانی ڕۆژهەڵاتدا بگەیەنێتە کۆتایی" ویڵسن. سەرچـاوەی پێـشوو ، لاپـەڕە ١٩١. هەروەها لەبارەی سەرەتای دەرکەوتنی ڕکەبـەریی -ئەنگلۆڕوسـییەوە بڕوانـە بەشـی داهـاتوو، یەکـەی یەکەم.

[156] لەبارەی بۆچوونە نەیارەکانی مینتۆ و هـەروەها ماڵکۆڵمیـشەوە بـۆ ئەرکەکـەی جۆنز و ڕێکـەوتنی بەراییەکەش بڕوانە سەرچاوەکەی سەرەوە، لاپەڕەکانی ٧٢-٧٦.

هاوپەیمانێتییەکەی خۆی لەگەڵ فرەنسادا هێنا، وەزیرەکەی خۆیشیی لە پاریس بانگکردۆتەوە، باڵوێزەکەی فرەنساشی بەشێوەیەك کردۆتە دەرەوە، کە زیاتر لە پەلاماردان و هێرش دەچێ، رێکەوتننامە تازەکانی خۆیی لەگەڵ فرەنسادا هەڵوەشاندۆتەوە، بە ووشەیەك، بێزاریی و نارەزایی خۆیی لە بەهێزترین پاشای جیهانیش دەربریوە. بۆیە تازە بۆئەوە زۆر درەنگە، کە بە شای ئێران بڵێیت سێر هارفەرد جۆنز بەپێی ئەو فەرمانانە هاتۆتە ئەوێ، کە پێیدراون و سەرباری ئەوەش دەسەڵاتی تەواوی هەیە نوێنەرایەتییەکەی خۆی لەوێ درێژەپێبدات و ئەو متمانەیەی پێیدراوە بیپارێزێت."[١٥٧]

لۆرد مینتۆ بەو تێگەیشتنەوە سازدانی (رێکەوتنە بەراییەکەی) پەسەند کردبوو، کە خۆی وەك ئەو کەسە دەستنیشان دەکرێ، کە تەواویشی دەکات. لەم رووەوە لە هەمان نامەیدا بە مالکۆڵمی گوتبوو: ئەو کەسەی، کە بۆ ئەم ئەرکە گرنگە متمانەی پێبکرێ"رێك جەنابتانن" ئیتر بە پێی دەستوور و نەریت مالکۆڵم دەستنیشان کرا و ئەویش لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (١٨١٠) دا لە سێیەمین و دووایەمین ئەرکیدا بەرەو ئێران ملی رێگای گرت.[١٥٨] لەم دەمەدا (شا فاز عەلی)ی ئێرانیش ئەرکێکی لە ئەستۆ بوو، کەوتبووە رێ بەرەو لەندەن، لەبەرئەوەی لەو دەمەدا پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی بریتانیا لەلایەن خودی حکومەتی ناو نیشتمانەوە سەرپەرشتیی دەکرا. (ئەبولحەسەن خان) ی نێردراوی ئێرانیش بۆلای کۆشکی پادشایی سەینت جەیمس(١٨١٠-١٨١١) گەیشتەکەی خۆیی (لە ئێرانەوە بۆ لەندەن و لە لەندەنەوە ئێران) بە هاوەڵیی (جەیمس مۆریەر—James Morier) کرد، کە ئەمەی دووایییان باڵوێزی بریتانیا بوو لە ئێران. سەرەکیترین کار و ئەرکی ئەو گەیشتەیش بریتی بوو لە مسۆگەرکردنی بڕو شێوازی ئەو بەخشینە داراییە ساڵانەی، کە لە رێکەوتننامە بەراییەکەدا بەڵێن درابوو بدرێت بە شا. بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەسیاسی و نە ئابووری

---

[157] Kaye, op. cit., I, 507-508.

[158] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم ئەرکەوە بڕوانە سەرچاوەکەی کایا، ئەوەی پێشوو، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی ١-٥٣. کایا ئەرکە سەرنەکەوتووەکەی دووەم فەرامۆش دەکات، بۆیە ئەمەیان وەك دووەم حساب دەکات.(بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، لاپەڕە ٥٨)

لەم گەیشتەوە نەکەوتەوە، ئەگەرچی ئەو گەشت و ئەرکە یەکێك لە سەرنجڕاکێشترین روداوە دیپلۆماتییەکانی ناو سەردەمی نوێیش پێکدەهێنێ.[159]

لە تاران، رێکەوتننامەیەك، ساڵی (١٨١٠) بە دەرکەوتنی ململانەیەك لە نێوانی (ماڵکۆلم و جۆنز) دا، مۆرکرا، کە زۆر لەوە دوورنەبوو ململانەیەکی خۆپەرستانە بێت. جۆنز نوێنەری تاجی پادشایی بریتانی بوو لەوێ و تازە دەستی دابووە سازدانی ئەو رێکەوتننامەیەی، کە بووبووە بناغەی پەیوەندییە ئەنگلۆ-ئێرانییەکان. بەو دیویشدا ماڵکۆلمیش نوێنەری حکومەت بوو، ئامادەییەکەی لە تاران بۆئەوەبوو کار بۆ ئەو رێکەوتنە بکات، کە کەسە رکەبەرەکەی دەستی دابوویە. ئەو هێندەی، کە بە تەنگ ئەم ململانەیەوە بوو، هێندە بە تەنگ گرنگیی ئەرکەکەی خۆیەوە نەبوو، بۆ ئەو تەنها حکومەتی هیندی لەئارادابوو، کە جەخت لەسەر هاتنی فریاگوزاریی بریتانی بۆ ئێران بکاتەوە. ماڵکۆلمیش ئەوپەڕی هەوڵی خۆیی خستبووەگەڕ، کە حکومەتی ئێرانی تێبگەیەنێت، کە ئەمیش هێندەی هاوڕێکەی خۆی گرنگە و وەکو هاوڕێکەی نێردراوێکی بریتانییە. جۆنزیش هەر بە هەمانشێوە هەڵسوکەوتی دەکرد. بۆیە بەرپرسیارانی ئێرانیش وریایانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم ناکۆکییەدا دەکرد، بۆئەوەی نەوەك یەکێك لەم دووکەسە ململانەکارە واتێبگات، کە هێندەی کەسەکەی بەرامبەری گرنگیی نییە. ململانەکەیان گەیشتە دوایلەی خراپی و ئەو خەڵکە کەمە بریتانییانەش، کە لە تاران بوون بەگشتی بووبوون بە دوولایەنی جەنگاوەر و هەرلایەکیان لەسەر یەکێك لەو دووانە بوون. کایا باسێکی باشمان لەم رووەوە بۆ دەکات: "حکومەتەکەی هیندستانیش خۆیی وا ساز و ئامادەکردبوو، کە لە پێش چاوی کۆشکی پاشایی ئێرانی رووی سێر هارفەرد

---

[159] لەبارەی نێردراوەکەی ئێرانەوە سێر پێرسی سایکس ئەم قسەیەی "چارلز لامب" مان بۆ دەگێڕێتەوە "ئەو کەسێکی سەرەکیی بوو ئێستا قسەی دەکرد، من سەعات شەش و نیوی بەیانی هەندێ خەڵکم بینی، کە ئەو لە خەو هەستا سەیری بکەن، بزانن چۆن خۆر دەپەرستێ، بەڵام ئەو نەهات، خەڵکی ئاساییش وا سەیریان دەکرد، کە ئەو کەسێکی بێکەڵك بێت".

بەڵام باڵوێزەکە لەڕاستیدا خۆرپەرەست نەبوو، بەڵکو موسڵمان بوو، ئەو پەرستنەش لەلایەن لامبەوە ئاماژەی پێکراوە، لەوانەیە نوێژکردنی بەیانی بوبێ. ئەم کابرایە بە روونی بووبووە بابەتی فزول و سەرسووڕمان لە بریتانیا، هەروەها خاکی بریتانیاش بووبووە مایەی سەرسووڕمانی ئەو، بۆیە هاتووە لەو گەشتەیدا (حەیرەت نامە- واتە تۆماری شتە سەرسووڕهێنەرەکان) ی نوسیوە. جەیمس مۆریێ یش کتێبێکی بۆ (نەمرکردن)ی ئەو نووسیوە، بەناوی (حاجی بابە لە بریتانیایە-Haji Baba in England) بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:

Sykes, op. cit., II, 309.

جۆنز رەش بکات، بەلام جۆنز خۆی وابیری دەکردەوە کە لەوانەیە حکومەتی هیندستان، کە خاوەنی دەسەلاتێکی بالاترە لەم، لەوانەیە دەسەلاتێکی وای بدەنێ بەتایبەتی لەلایەن فەرمانڕەوای هیندەوە پێیببەخشرێ."[160]

لە راستیدا ناکۆکییەکەی نێوانی مالکۆلم و جۆنز رەنگدانەوەی بوونی ململانەی نێوانی حکومەتەکەی هیندستان و حکومەتەکەی نیشتمان بوو، دیارە ناکۆکییەکەیان لەسەر ئەوەبوو، کە داخۆ دەبێ کامیان کۆنترۆلی راستەوخۆی پەیوەندییەکانی نێوانی بریتانیا و ئێران بەدەستەوە بگرن. حکومەتەکەی هیندستان ئەوپەڕی هەولی خۆیی دا، بۆئەوەی لەمەدا بەسەر حکومەتەکەی نیشتماندا زال ببێ، بەلام ئەوەی نیشتمانیش زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی دەسەلاتی رەهای هەبێ ، لەم رووەوە جۆنزی ئاگادار کردەوە و ئەمیش لەلای خۆیەوە لەڕۆژی دووی حوزەیراندا مالکۆلمی تێگەیاند. و یەکسەر لە لەندەنیشەوە (سێر گۆر ئۆوزیلەی) یان نارد بۆئەوەی جێگەی جۆنز بگرێتەوە. ئەم بالوێزە نوێیە یەکسەر لەلایەن فەرمانگەی کاروباری دەرەوەی بریتانییەوە متمانەی پێدرا و کۆنترۆلی تەواوی پەیوەندییە ئەنگلۆ-ئێرانییەکانیان خستە دەستی ئەوەوە. ئەمەش هەنگاوێکە نامۆ نەبووە و هەمیشە هەر چاوەڕوان کراوبووە.

مالکۆلم زوو لەوە تێدەگات هەر هەولێك لەلایەن خۆیەوە بدرێ بێهوودە دەبێ. چونکە لۆرد مینتۆیش ئەو ئامۆژگارییەی کردبوو. بۆیە لەماوەی یەك مانگدا لە ئێرانەوە ملی رێگەی گرت بەرەو مالەوە.[161]

ئیتر نوێنەرایەتییەکەی حکومەتی نیشتمان ، لەوە بەدوواوە دەیتوانی بەپێری کاروباری بازرگانیی خۆیەوە بچێت، بەبێ ئەوەی لەلایەن حکومەتی هیندستانەوە لەمپەری بهێنرێتە سەر رێ. ئەرکە زۆر گرنگەکەی پێش سێر گۆر ئۆوزیلەی ئەوە بوو رێکەوتننامەیەکی "هەمیشەیی" پێکبهێنن، کە جێگەی رێکەوتننامە "بەراییەکە" بگرێتەوە، کە سالێك دەبوو سازێنرا بوو.

پاش چەندان دانووستاندنی درێژکراوە توانیی لەگەل حکومەتی ئێراندا بگات بە رێکەوتنێك و ئەوەبوو لە رۆژی (١٤/مارس/١٨١٢) لە تاران ئیمزایان کرد. ئەگەرچی هەتا لەلایەن حکومەتی نیشتمانیی بریتانییشەوە پەسەند نەکرایە، نەدەبوو بە دووایین دەق، بەلام هەر لە رۆژی ئیمزاکردنیەوە هێزی کارپێکردنی پێدرا. لەگەل وەرگرتنی دەقی

---

[160] Kaye, op. cit., II, 14..

[161] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٧.

ڕێکەوتننامەکەدا "کە پێیدەگوترا ڕێکەوتننامەی هەمیشەیی هاوڕێیەتی و هاوپەیمانێتی" حکومەتی نیشتمان پێشنیاری هەندێك هەموارکردنی وردی تێداکرد. دووایی لە تاران لە ڕۆژی (٢٥/ تشرینی دووەم/١٨١٤) ئیمزاکرا – جەیمس مۆریێ و باڵوێزی بریتانیا لە ئێران ، بە نوێنەرایەتیی حکومەتی خاوەن شکۆ ئیمزایان کردووە.[١٦٢]

ئەم ڕێکەوتننامەیە لە دووایین قەواڵەیدا دیباجەیەك و پانزە بەشی تێدابوو. دیباجەکەی بەم شێویە دەست پێدەکات: "ئەم گەلایانە چەپکێکن لە باخچەی بێدرکی ڕێکەوتنەوە لێکراونەتەوە و بەدەستی دانووستانکارانی ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیە لە فۆڕمی ڕێکەوتنێکی بەهێزدا پێکەوە بەستراونەتەوە ، کە بەندەکانی بۆ هاوڕێیەتی و دۆستایەتی تێکەڵکراون" بەڕێکەوت ئەم دەربڕینانەی سەرەتاکە زۆر پڕ مانان و گوزارە لە دیپلۆماسییەتی ئێرانی دەکەن لەودەمەدا. ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەش سەلمێنرابوو، کە دەکرێ ئەو "گەلا"یانە هەر شتێك بن، بەڵام ئەوەبوو ئەم جارە هیچ نەبێ بۆ ئێرانییەکان "بێ درك" بوون. هەرچی بەرژەوەندییەکانی بریتانیاش بوو لە ناو ئێراندا تا ئەو دەمەو بەشێوەیەکی بەرایی سیاسییانە بوون و کاروباری بازرگانی دوواخرابوو بۆ (ڕێکەوتننامەیەکی بازرگانی) ی تر لە ئایندەدا، کە ئەوەبوو تا ساڵی (١٨٤١) نەهات پێکنەهات.

بەپێی بەندی یەکەمی ئەم ڕێکەوتننامەیە خۆسەرقاڵکردنی ئێران لەگەڵ هەر هێزێکی تری نەیار بە بریتانیای مەزن بێمانا و هەڵوەشێنراوە بوو، هەروەها ئێران بەڵێنی ئەوەی دابوو، ئەوپەڕی یارمەتیی فریاگوزاری پێشکەشی بریتانیا بکات، ئەگەر بریتانیا پێویستی بەوە هەبێ لەدژی هەر داگیرکارێك بەرەڤانی لە هیندستان بکات.

هەروەها ئێران ئەوەشی لەسەر خۆی کردبوو بە مال، کە ئەگەر شەڕ لەنێوانی هیندستان و ئەفغانستاندا بەرپابوو، ئەوا ئێران یارمەتیی سوپای بریتانیا بدات (بەندی ٨). بەڵام ئەگەر شەڕ لەنێوانی ئەفغانستان و ئێراندا بەرپابوو، ئەوا دەبێ بریتانیا بەبێ لایەنی بمێنێتەوە (بەندی ٩) . لەناو کەنداوی فارسیشدا دەبێ کەشتییە جەنگییەکانی بریتانیا یارمەتیی ئێران بدەن، لەدژی هەر دوژمنێکی گریمانکراو "ئەگەر جۆری ئەو یارمەتییە ئاسان و کردەیی بێ!"(بەندی ١١). ئەگەر ئێرانیش داگیرکرا، ئەوا حکومەتی هیندستان یان یارمەتییەکی فریاگوزاریی سەربازی پێشکەشی شا دەکات، یان

---

[162] بۆ دەقی یەکەمینیان، ئەوەی ساڵی (١٨١٢) بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Aitchison, op. cit., XII, 49-54.

یارمەتییەکی دارایی ساڵانەی دەداتێ، کە برەکەی (٢٠٠,٠٠٠ تومەن) بێت، کە دەکاتە نزیکەی (١٥٠,٠٠٠) پاوەندی ئیستەرلینی. پارەکە دەبوو بە قیست بدرێ، چونکە کە شەڕ دەست پێدەکات، دەبێ ئەو پارەیە بۆئەوە تەرخان بکرێ، کە سوپای پێ دیسپلین و باش بکرێ بۆ گەشەکردن."ئەوکاتە دەبێ وەزیرە ئینگلیزەکە قایل بێ بەوەی کە ئەو پارەیە بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکرێ، کە بۆی تەرخان کراوە."(بەندی٤)[١٦٣]

لەڕاستیدا رێکەوتننامە هەمیشەییەکەی ساڵی (١٨١٤) دووایین دارشتن بوو، زۆر گشتگیرتریش بوو لە رێکەوتننامە بەراییەکەی ساڵی (١٨٠٩)، کە بناغەی زاڵبوونی بریتانیای بەسەر ئێران و لەوێشەوە بەسەر سەرەکیترین بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دارشت. بەدەر لەو بەهێزبوونەی کاریگەریی بریتانیا لەناو ئێرانیشدا، رێکەوتننامە هەمیشەییەکە دوو گەشە و بەرەوپێشچوونی بەرچاوی هێنایەپێشەوە: یەکەمیان ئەوەبوو، کە ئێران بۆ یەکەم جار و لە هەموو رووە دیپلۆماتییەکانەوە لکێنرا بە حکومەتی نیشتمانەوە، نەك حکومەتەکەی هیندستان، ئەم راستییەش وای لە حکومەتی هیندستان کرد ئیتر بتوانێت گرنگییەکی باش بدات بە بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لەناوچەی کەنداوی فارس و میسۆپۆتامیادا.

دووەمیشیان ئەوەبوو، کە بۆ یەکەمین جار بریتانیای مەزن هەستی بەوە کرد و ددانی پێدانا کە ئێران و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەو زۆن و کایە گریمانکراوەبن، کە ببنە بواری بەریەککەوتنی نێوانی رووسیا و بریتانیا. چونکە جاران وا دادەنرا رووسیا لە ناوچەیەکی ترەوە بتوانێت گەشە بکات.[١٦٤] لێرەشەوە دەچینە سەر ئەو باسە و دەبینین، کە چۆن بریتانیانییەکان کاریگەرییەکەی خۆیانیان لەناو کەنداوی فارسدا چەسپاند.

لەوانەیە ئەوە لێرەدا شیاو بێ وێنای بکەین، کە لەپاش ئەوەی بریتانییەکان توانییان بنکە فرەنسییەکەی ناو مۆریشیۆس داگیربکەن و ماوەیەکی زۆریش بەسەر ئەوەدا تێپەڕی نەکردبوو، کە ئیمامی عوومانیش گوتبووی کە خۆیان پشت بەو بنکە فرەنسییە دەبەستن، ئیتر لەپاش ئەو گۆڕانانەوە عوومان کە دەکەوێتە ناو زاری کەنداوەوە ببێتە مایەی گرنگپێدانی بریتانییەکان. ئەگەرچی لە دەوروبەری ساڵی

---

[163] بۆ بینینی دەقی رێکەوتننامەکە بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، بەرگی پێنجەم، لاپەڕەکانی ٥٣-٥٦:
British and Foreign Papers, I, Pt. I, 261-264.

[164] بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە، بەشی پێنجەمی.

(١٨١٠) دا بریتانیـا هەسـتێکی وای هـەبوو، کـە ئـەو هەرێمـە و سـەعیدی ئیمامیـشی فەرامۆش بکات، لەبەرئەوەی ئەم ئیمامە لە بەرامبەر دەسەڵاتی روو لە هەڵکشانکردووی وەهابییەکانی ژێر دەستی ئـیبن سـعود و ژەنەراڵـە گەورەکـەی (موتڵـەق) دا، کـەوتبووە ململانەیەکی نێوانی ژیان مردنی واوە بواری ئەوەی نەمابوو هیچ گرفتێك دروسـت بکـات.

بەڵام لەو کاتەدا، کە عووممان کەوتبووە بەر ئەگەری داگیرکردن، ئیتر بریتانیـاش ناچـار بـوو جموجووڵێـك بکـات ، لـەو کاتـەدا وەهابییـەکان هەنـدێ پاشەکـشەیان کردبـوو، لەبەرئەوەی چووبوون رێگری لەو پەلامارانەی میسر بکەن، کە لە سـاڵانی (١٨١٢/١٨١١) دا ویستبووی پەلاماری مەکە و مەدینە بدات. کـە لـە سـاڵی (١٨١٣) دا موتڵـەق دەسـتی بەتاڵ بوو، گەڕایەوە بۆسەر هەڵمەتەکەی خۆی لـە دژی عووممـان ، لـە پیـا هەڵپژانێکدا کوژرا و لە ساڵی پاشتریشدا خودی کوڕە گەورەکەی (ئیبن سعود) مرد. سەعیدیش ، کـە خـۆی لـە سـاڵی (١٨١٣) دا داوای هـاتنی نوێنـەرێکی بریتـانیی کردبـوو، ئێـستا ئـیتر کەوتبووە ئەوەی داوای فراوانکردنی کایەی کاریگەرییەکەی بریتانیا بکات.

بەڵام لەوێ هێشتا هەر ئاژاوەگێڕییەکانی چەتەکانی جەواسم مابوون و لـە بنکـەکانی خۆیانەوە لە کەنارەکانی بـاکووری کەنداوەوە کـاڵا بازرگانییـەکانی بریتانیـان بـە تـاڵان دەبرد و پێدەچوو لەپاش مردنی باڵاترین کەسی دەسەڵاتداری بنچینەیی ناویانەوە (ئیبن سعوود) ەوە موڵك و داهاتەکانیان زۆرتر ببێ. لەگـەڵ هـاتنی زسـتانی سـاڵی (١٨١٨ – ١٨١٩) دا کـە هـۆزی جەواسمـەکان زیـانێکی قورسـیان لـە بازرگـانیکردنی بریتانیـا دا، بارودۆخەکان گەیشتنە ئاستی قەیران. بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو بـارە لەدەستـچووانە و بۆ لێدانی گورزێکی کوشندە لە کاری چـەتەگەری لـەو هەرێمـەدا، حکومـەتی هینـدی بـە پەلە و لەژێر فەرمانی (مێجەر ژەنەراڵ سێر ویلیـەم گرانـت کێیـە– Sir William Grant Keir) دا هێزێکی گەورەی رەوانەی ناوچەکە کرد. لـە کۆتاییـەکانی سـاڵەکەدا چـەتەکان بە چەندان شەڕی گەرم و گەورەوە گلان. بۆیە بە چـەندان زیـانی قورسـەوە ناڵانـدیان و چەند شکستی خراپیان خوارد. بنکـەی سـەرەکیی چـالاکییەکانیان لـە (راس ئەلخەیمـە) داگیرکرا و کرا بـە بنکـەی کـاتیی بارەگـای سـەرەکیی (ژەنـەراڵ کێیـە). تەنانـەت پـاش ئەوەی، کە هێزەکانی جەواسمەکان بە تەواوی بـەزین کەشتییە جەنگییـەکانی بریتانیـا سەردانی زۆربەی بنکەکانیان کرد و چەندان لێدانیان ئاراستەدەکردن، بەئومێدی ئـەوەی

بەتەواوی پەکی چالاکییەکانیان بخەن.[١٦٥] بەمەش بڕبڕەی پشتی چەتەگەری لەناو کەنداودا شکێنرا. ئەم ڕووداوە هەلێکی نایابی پێشکەشی ژەنەراڵ (کێیە) کرد. نەك تەنها لەوەدا، کە توانیی موڵکەکانی بریتانیا بەدەست بهێنێتەوە، بەڵکو توانی هەژموونێکی سەختی باشی خۆشیان لەناو ئەو ئاوانەدا دابمەزرێنێت.

لە ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتیدا، کە لەگەڵ شێخی گەورەی هۆزەکانی جەواسمدا لە (٦/ کانوونی دووەم/١٨٢٠) دا ئیمزا کرا شێخ بەڵێنی دا چەند قەڵا و بنکەیەکی سەختی خۆیان و بڕێکی باشی ئەو تالانی شەڕانەی دەستیان بەسەریاندا گرتبوو بداتەوە بەدەستەوە. بەندی چوارەمی ڕێکەوتننامەکە دەڵێت:"بەپێی ئەم مەرجانە دژایەتیکردنی نێوانی ژەنەراڵ و سوڵتان بن سگوور و شوێنکەوتووەکانی سوڵتان دەوەستێ، لەگەڵ ئەو خاڵە ناوازەیەشدا، کە نابێ بەلەمەکانیشیان بێتە ناو دەریاوە"

ئەم ڕێکەوتننامەیە و چواری تریش لە ڕۆژانی (٨-٩-١١ و ١٥ی کانوونی دووەمدا) لەگەڵ چەند شێخێکی دەسەڵاتداردا ئیمزا کران و هەمووشیان بۆئەوە گەڵاڵە کرابوون، کە ئەو تالانیانەیان پێ بگەڕێندرێتەوە، کە لە ئەسڵدا لە بریتانییەکان سەندرابوون، هەروەها بۆ ئەوەیش پەکی توانای هێرشبردنی ئەو هۆزە بەزیوانەی پێبخەن. بۆیە دەبوو هەم غەنیمەکان بگەڕێندرێنەوە و هەم کەشتییەکان و چەك و کاڵاکان و دیلە هیندییەکانیش ئازادبکەن.[١٦٦]

گرنگترین دەستکەوتی "کێیە" بریتی بوو لە بە ئاکامگەیاندنی "ڕێکەوتننامەیەکی گشتی لەگەڵ هۆزە عەرەبەکانی کەنداوی فارسدا" کە ڕێکەوتننامەیەك بوو، بەشێوەیەکی کاتی، لەگەڵ ئەو چەند ڕێکەوتننامە بەراییەی تۆزێك پێشتر ئاماژەمان پێدان بۆئەوە ئامادەکراوبوون کەنداو لەو بێزارکارییە هەمیشەییەی دەرباز بکەن و وایلێبکەن شوێنێکی سەلامەت بێت بۆ بازرگانی کردنەکەی بریتانیا. هەمووشێخە دیار و باڵادەستەکان، چ جەواسمەکان بن، یان هەر هۆزێکی تر، پێشوازییان لێدەکرا پەیڕەویی

---

[165] Low, C. R., the India Navy, I, 363. For Details of This memorable expedition, see Ibid, 351-361. For comprehensive narrative on Piracy in the Persian Gulf, see Wilson, op. cit., Chapter XII, 192-212.

[166] بۆ بینینی دەقی ئەم ڕێکەوتننامانە، بڕوانە(Aitchison, op. cit., XII, 166-171) لەپێش ساڵی (١٨٢٠) وە تەنها یەك نموونە لە ڕێکەوتننامەی نێوانی بریتانییەکان و شێخەکانی ناوچەیکەنداو هەبوو. ئەوەش لە ساڵی (١٨٠٦)دا لەگەڵ شێخی گەورەی جەواسمەکاندا ئیمزا کرابوو، بۆئەوەی سەلامەتیی بەڕێوەچونی بازرگانیی بریتانیای لەناو کەنداودا پێبپارێزرێ، بەڵام لەبەرچاو نەگیراوە، دەقەکەی لە سەرچاوەی پێشوودایە لاپەڕەکانی ١٦٥-١٦٦.

لێبکەن و ببنە ئەندامی "عەرەبە دۆستەکان- وردتر بڵێین عەرەبە بێوەییەکان". لە رۆژی دەرچوونەکەیدا ، کە "هەشتی کانوونی دووەم بوو لە رەئس ئەلخەیمە" لەلایەن دوو شێخی دیارەوە ئیمزا کرا، پێش کۆتاییهاتنی مانگەکەش سێ شێخی تریش ئیمزایان خستەسەری. هەموو پێکەوە دە سەرکردەی عەرەب بەڕەسمی پەیڕەوییان لە رێکەوتننامەکە کرد و ئیمزاکردنی دوایین کەسیشیان لە رۆژی (١٥ی مارس) دا بوو. تەنانەت دوو فەرمانڕەواکەی دوو دورگە گرنگەکەی "بەحرەین"یش لەناو ئەو "عەرەبە دۆستان"ە دابوون. لە رۆژی (٢ی ئەپریل -نیسان) ی هەمان ساڵدا ئەم رێکەوتننامەیە لەلایەن فەرمانڕەوای گشتیی هیندستانیشەوە ئیمزا کرا.

ئەندامانی ئەو هۆزانەی رێکەوتننامەکەیان ئیمزا کرابوو بۆیان نەبوو لەسایەی هیچ بارودۆخێکدا هیچ جۆرە تاڵانییەک، یان چەتەکارییەک بکەن. سزای ئەنجامدانی هەر کارێکی لەم جۆرانە کوشتن و لەدەستدانی ماڵ و موڵکەکان بوو. دەبوو سەرکردەی هۆزە ئیمزاکردووەکانیش لە جێبەجێکردنی سزادانی پێشێلکاراندا هاریکاریی حکومەتی بریتانی بکەن.

کەشتییەکان دەبوو ئاڵایەکی سپی بەرزبکەنەوە، کە ناوەڕاستەکەی چوارگۆشەیەکی سووری تێدابێ، واتە چوارگۆشەیەکی سوور لەناوەڕاستی زەمینەیەکی سپیی گەورەتردا، بە نووسینی پیتەوە، یان بەبێ نووسین. کە ئەمە بەدیوێکدا هێمایەکی ئاشتی بوو لەنێوانی خۆیاندا و بە دیوەکەی تریشدا لەنێوانی خۆیان و بریتانییەکانیشدا. پاپۆڕەکانیان دەبوو بەڵگەی (تۆمارکردن و رێپێدان )یان پێبێت. بۆئەوەی لەوکاتەدا، کە لەلایەن بریتانییەکانەوە، یان هەر لایەنێکی ترەوە، کە بیانبینێت و داوایان لێبکات، ئەو بەڵگانە پیشان بدەن. دەبێ ئەو بەڵگانە زانیاریی زیندو و نوێی پێویستی وەک خاڵی کەوتنەجووڵەی کەشتییەکە، ئاراستەکەی، چەکەکانی سەری، تواناکەی و ژمارەی دەریاوانەکانی. هەموو بەندەرەکانی ژێر حوکمی بریتانیا بۆ بازرگانیکردن ، لەبەردەم ئەم کەشتییانەدا ئاوەڵا بوو.[١٦٧]

---

[167] ئەم رێکەوتننامەیە، لەگەڵ ناوەکان و ناونیشانەکانی ئەو کەسانەی ئیمزایان کردووە، لە سەرچاوەی پێشوودا هەیە، لاپەڕەکانی ١٧٢-١٧٦.

لەمەوە بریتانیا خۆیی وەك هێزێكی زاڵی ناو كەنداوی فارس دامەزراند. چونكە ئەو پلەوپایەیەی بەدەستی هێنایەوە ، لەو دەمەوە ئیتر دەستی بەسەرداگرت و بەشێوەیەكی جێگیریش بەهێزی كرد.[168]

**٢. كۆتایی سەردەمێك لە میسۆپۆتامیادا**

لە میسۆپۆتامیادا و لەنێوانی سالآنی (١٨١٠ و ١٨٣٠) دا بریتانییەكان رووبەرووی هەلوێستێك بوونەوە ، كە زۆر جیاواز بوو لەو هەلوێستەی لەناو ئێران و لە كەنداوی فارسدا هەیانبوو. بەناو ولاتەكە لەژێر قەلەمڕەوی سولتاندابوو، بەلام لە واقعدا لەلایەن پاشاوە بەڕێوەدەبرا. بریتانییەكانیش بۆئەوەی لە هەردوو رووی یاسایی و پراكتیكییەوە پرۆژەكانی خۆیان بوونیادبنێن دەبوو لەگەلْ هەردوو لای ئیستەنبولْ و بەغدا دا رێك بكەون. چونكە هەر رێپێدان و تەنازولێك لەلای ئاستانەوە بەدەستبهێنرایە، لەناو میسۆپۆتامیادا هیچ بەهایەكی نەدەبوو تا لەلایەن پاشایشەوە پەسەند نەكرابا. بەدیوێكی دیی كەیشدا زۆر ناجێگیر بوو، لەبەرئەوەی چۆن بە شۆڕشێكی خوێناوی دەستی پێكرد، ئاواش بەشۆڕشێكی تر كۆتایی پێهێنرا، كە خوێنڕێژییەكەی لەوەی پێشوو كەمتر نەبوو. هەر لە دوای لادانی ئەم پاشایەتییەوەبوو، كە جارێكی تر ئامبازبوونەوەی بریتانیا بە ولاتەكە، گریمانی شیانی وەرگرت.

دووەمین و سێیەمین دەیەی سەدەی نۆزدە، دوایەمین چارەكی سەردەمە سەرەكییەكەی ناو مێژووی میسۆپۆتامیا پێكدەهێنیْ، و پێیدەگووترێ (سەردەمی مەملووكی-١٧٥٠- ١٨٣١).[169]

---

[168] سەركردە عەرەبەكانی كەنداو لە رێكەوتننامەكەی سالْی (١٨٥٣) دا بەلێنیاندا، كە : ئێمە زۆر قایلین بەوەی، كە پاراستنی ئاشتی ئێستە لەنێوانی ئێمەدا بەرپابووە و دەبیْ لەلایەن حكومەتی بریتانییشەوە چاودێریی بكرێ. ئەم حكومەتە هەمو كاتێك بۆ دلْنیابوون لە كارپێكردنی بەندەكانی، چاودێری دەكات و خواش پشت و پەنای هەمووانە.. سەرچاوەی پێشوو..لاپەڕەی ١٨١. پاراستنی كیبلْە ژێردەریاییە راكێراوەكان لە فاوەوە تا یاسك و لە یاسكیشەوە تا كەراچی و مەسقەت لەلایەن حكومەتی هیندستانەوە بوونە هۆی بەهێزكردنی كاریگەرییەكە: بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:
Persian Gulf, a Handbook Prepared by the Historical Section of the British Foreign Office, No. 76.(London, 1920), 68-69.

169 تاكە سەرچاوەی بەردەست لەبارەی ئەم سەردەمەوە، ئەوەی لۆنگریگە:
Four Centuries of Modern Iraq, Chapter VII-X, 163-276.

لە تەواوی ئەم سەردەمەدا هەموو پاشا گەورە و بەرچاوەکان و هەروەها هەموو بچوکتر و کەمترەکانیشیان لەو کۆیلە ئازادکراوانە بوون، کە رەچەڵەکیان گورجی بووە. یەکەمین پاشایان، کە سولەیمان ئاغا بووە، لە هەمان چەشنی ئەوان بووە. ئەم سولەیمان پاشایە موڵکی حەسەن پاشای بەغدا بووە و لەلایەن ئەوەوە پەروەردە و ئازادیش کراوە. بۆیە ، کە ئەحمەد پاشای کوڕی سەرۆکەکەی (واتە کوڕی حەسەن پاشا-و) لەپاش باوکی فەرمانگەکە دەگرێت بە دەستەوە، ئەم خزمەتگوزاریی گرانبەها و باشی پێشکەش دەکات. هەروەها جێگە و پۆستە چۆڵەکانی ناو حکومەتە خۆجێییەکەشی بۆ پڕ دەکردەوە، بە پۆستی (کەهییە)یشەوە، کە بالاترین پۆستی ناو پارێزگای بەغدا بووە. لەبەرئەوەی کەسێکی چالاك و بێبەزەیی بووە لە ئەنجامدانی کارەکانیدا ناوبانگێکی باشی پەیداکردووە و هەمیشە لە دوای دواوە ئەم دووەمین کەس بووە.

کە ئەحمەد پاشا دەمرێ ، سولەیمان ئاغا تاکەکەس دەبێ چاوی دەکەوێتەسەر بۆ جێگەگرتنەوەی. لەلایەن ئاستانەشەوە هەوڵێك درا، بۆئەوەی کەسێك لەو ئۆفیسەدا دابنێت، کە هەڵبژاردەی دەستی خۆی بێت، بەڵام باجی زۆری ئەو هەوڵەی دا و سەرکەوتوویش نەبوو. سولەیمان پاشا توێژێکی زۆر بەهێزی لەناو وڵاتەکەدا هەبوو، لەبەرامبەر هەوڵی سوڵتاندا بۆ قەدەغەکردن و رێپێگرتنی، دەیتوانی رابوەستێ. لەپاش نزیکەی سێ ساڵی هەوڵی نەزۆکی سوڵتان بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروبارەکان، چەندان هەڵگەڕانەوەی جدییانە بەرپابوون و ئینجاش سولەیمان پاشا لە ئۆفیسدا دانرا. سولەیمان- کەئێستا ئیتر بوو بە پاشا- بۆ دەربازبوونی خۆی لە رقی هەموو نەیارەکانی رێوشوێنی توندی گرتەبەر و بە زوویی دەسەڵاتی خۆیی بەسەر هەموو بارودۆخەکاندا سەپاند. لە دەمی فەرمانڕەوایی ئەودا (١٧٥٠-١٧٦٢) وڵاتەکە لە ئاشتییەکی دادپەروەرانەی باش بەهرەوەر بوو، کە ئەمەش سەرەکیترین کاراکتەری سەرکەوتوویی فەرمانڕەوایی ئەو رۆژگارە بوو.[١٧٠]

بە مردنی ئەو، وڵاتەکە گلایە گۆبەندی هەژدەساڵی نائارامی و نائاسایشییەوە(١٧٦٢ - ١٧٨٠).[١٧١] لەو سەردەمە کورتەدا شەش پاشا فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیان کرد: یەکەمیان (عەلی پاشا) بوو، دوو ساڵ حوکمی کرد و ئینجا بە دەستی (عومەر پاشا) ی

---

[170] Four Centuries of Modern Iraq, Chapters VII-X, 163-276.

[171] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٧٢-١٨٦.

نەیاری و شوێنگرەوەشی کوژرا. ئەمیش ماوەی دەساڵ فەرمانڕەوایی کرد و هەمیشەش (دەسەڵاتەکانی هەر روو لە کەمبوونەوە بوون.) ئەمیش لە ساڵی (١٧٧٥) دا لەلایەن (موستەفا پاشا) وە جێگەی گیرایەوە، ئەمەی دووایییان لەلایەن ئاستانەوە دەستنیشان کرابوو. ئەمیشیان لەگەڵ (عەبدوڵڵا ئاغای مەملوکی) دا کەوتە ململانەی قورسەوە و لادرا و لەلایەن (عەبدی پاشا) وە جێگەی پێگیرایەوە، کە ئەمیش هەر دەستنیشانکراوێکی تری ئاستانە بوو، بۆ ئەو پۆستە. ئەم عەبدی پاشایە تەنها یەك هەفتە فەرمانڕەوایی کرد و ئیتر (عەبدوڵڵا ئاغا) کۆنترۆڵی تەواوی بەغدای گرت بەدەستەوە.

وەك قایلبوون بە (ئەمری واقع) سوڵتان بەپێی رێوشوێنی لەبەرچاوگیراو، عەبدوڵڵا ئاغای لە ئۆفیسدا دامەزراند و بەمەش بوو بە _عەبدوڵڵا پاشا_ بەڵام پاشای نوێ لە ململانەکردندا چەند بەهێز بوو، بەپێچەوانەوە، لە فەرمانڕەواییکردنی ئۆفیسەکەیدا هێندە لاواز بوو. تەندروستیی نەخۆش و رۆچوونی بەربادی خۆی بەناو هەوەسبازیدا وایانلێکرد کاتی فەرمانڕەواییکردنەکەی کورت بێت و ئەوەبوو لە ساڵی (١٧٧٧) دا مرد. شەڕە دەنووکێکی نوێی ناوخۆیی لەسەر پڕکردنەوەی ئۆفیسە چۆڵەکە دەستی پێکرد. (حەسەن پاشا) ی کاندیدی نوێی ئاستانە لەوە دوور بوو بتوانێت بارودۆخەکە بباتەوە شوێنی خۆی و ئارامی بهێنێتە ئاراوە. لەکاتێکدا هەردوولای (وڵاتەکە و ئاستانەیش) ماندوو بووبوون بەدەستی شەڕەدەنووکی ناوخۆیی و خوێنڕشتنەوە، لەناو ئەو دیمەنەدا کابرایەك دەرکەوت و توانیی ببێتە یەکێك لە دیارترین فەرمانڕەواکانی ناو مێژووی نوێی میسۆپۆتامیا.

ئەو کابرایەش (سولەیمان پاشا) ی گەورە بوو (١٧٨٠ – ١٨٠٢) پیاوێکی بە سەلیقە و دیاری، پڕ توانا و عەقڵ بوو.[172] لەکاتێکدا پارێزگاری بەسرە بوو، لە ساڵی (١٧٧٩) دا چاوی خستبووە سەر ئەوەی لە بەغدا پۆستێکی باڵای دەست بکەوێ، چەند نێردراوێکی سازدراوی ناردە لای سوڵتان و سوڵتانی لەم ئارەزووەی خۆی تێگەیاند و بیری لە دژایەتیکردن و ململانە نەکردەوە. هەر لەو دەمەدا لەلایەن (مستەر لاتۆچ) ی نوێنەری بریتانییەکان لەناو بەسرەدا کۆمەکی پێکرا، "چونکە مستەر وەك نوێنەری نێردراوی تایبەتیی ئەم وابوو بۆ کارکردن لەنێوان و خۆی و ئیستەنبوڵدا و بۆ هەر

---

[172] لەبارەی کەسێتی و کارەکانیەوە بڕوانە سەرچاوەی پێشووی÷ بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی ١٨٧– ٢٢٠.

جارەیش پارەیەکی خەرجیی باشیی پێدەدا ". بۆیە (ئەوەبوو هەوڵەکانی سەریگرت) و لە بەهاری ساڵی (١٧٨٠) دا بەپێی ڕێوشوێنەکان وەك پاشای بەغدا دەستنیشان کرا. ئەگەرچی بەپێی زۆری ئەو ململانانەی لەئارادابوون تا مانگی تەمموزی ئەو ساڵە نەیتوانی لەکورسیی حوکمکردنەکەی خۆی دابنیشێت. لەماوەی بیست و دوو ساڵ فەرمانڕەواییکردنیدا وڵاتەکە لە ئاشتی و گەشەکردن بەهرەمەند بوو. لەگەڵ بەرتانییەکانیشدا تا کۆتایی هەر پەیوەندیی دۆستانەی هەبوو.

بەمردنی پاشای گەورە (١٨٠٢) سەرلەنوێ ململانەی خوێناوی لەسەر گرتنەوەی شوێنەکەی هەڵگیرسایەوە. (عەلی پاشا) پیاوێك بوو بەهێز خۆی سەلماند. یەکێك لەو کەسانەی ململانەیان لەگەڵدا دەکرد بە خەنجەر کوژرا و چواردە ئەفسەریشی هەبوو خنکێنران. ئەوی تریشیان کە توانای ململانەکردنەکەی لاواز بوو ملکەچ کرا و کرا بە پارێزگاری تکریت لە باکوور. فەرمانڕەواییەکەی (عەلی پاشا) یش کورتی هێنا و لە (١٨/ئاب/١٨١٠) دا کۆتایی پێهات. لەو ڕۆژەدا خۆی لە نوێژدا بوو، لەلایەن دەستەیەك پیاوکوژەوە درایە بەر خەنجەر و کوژرا، پاشانیش گوترا، کە (لەبەر کێشەی تایبەتی کوژراوە). لەژێر فەرمانڕەوایی ئەمدا وڵاتەکە لە برێك ئاشتی بەرهەمەند بوو، کەم تا زۆر ململانەکانیش پچڕ پچڕ کەم بووبوونەوە.

بەدوای ئەمیشدا سولەیمان پاشای گەنج هات، کە نازناوەکەی -بچکۆلە- بوو، لەلایەن توێژە بەهێزەکانی ناو کۆمەڵەوە پشتگیریی لێدەکرا. لە ساڵانی کەمی فەرمانڕەوایی کردنی سولەیماندا (١٨٠٧ – ١٨١٠) هەندێ ڕووداوی گەورە لەنێوانی ئەم و بریتانییەکاندا ڕوویدا. کاتێك لە ساڵی (١٨٠٧) دا هەڕەشەی دوژمنایەتیکردنی یەکتری کەوتە نێوانی ئاستانە و بریتانییەکانەوە پاشا دانیشتوانە بریتانییەکانی ناو بەغدا و بەسرەی قایل کرد، کە لە وڵاتەکەدا بمێننەوە و هەموویانی خستنە ژێر پاراستنی خۆیەوە. دووساڵی تر پاش ئەوەش، کە پەیوەندییەکانی نێوانی عوسمانی و بریتانییەکان گەیشتە ئاستێکی زۆر سەخت، پاشا بۆچوونێکی پێچەوانەی گرتەبەر. لەبەر چەند هۆیەکی تەمومژاویی ناڕوون دەستی دایە زنجیرەیەك سەرکوتکردن و سووکایەتی پێکردنی ئەوانەی لەناو بەغدادا دانیشتبوون، تا ناچاری کردن بکشێنەوەو لێیدەربچن.[١٧٣]

---

[173] Aitchison, op. cit., XI, 2.

ئەوەی، کە هەڵسوکەوتی سولەیمان بەرامبەر بە بریتانییەکان پێچەوانەی هەڵوێستی سوڵتان بوو، شتێکی نامۆ نەبوو لە ئاستی ئەو (ڕاستییەدا)، کە پاشا لەناو ناوچەکەی خۆیدا فەرمانڕەوا بوو. ئەوەش شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشترە، کە تێبینیی ئەوەش بکەین ، کەگۆڕانێکی رادیکالانەی "تەمومژاوی" لە سیاسەتی پاشادا لەبەرامبەر دانیشتوانەکاندا روویدا.

(هارفەرد جۆنز)، کە لەو دەمەدا دانیشتوویەکی ناو بەغدا بوو، لە ساڵی (١٨٠٨) دا گەڕایەوە و لەلایەن (کلاودیۆس جەیمس ریچ) ەوە جێگەکەی گیرایەوە. ریچ ئەوەندەی وەك فەرمانڕەوایەکی ناخۆیی هەڵسوکەوتی دەکرد، هێندە وەك دیپلۆماتێکی بێگانە هەڵسوکەوتی نەدەکرد. شوێنی نیشتەجێبوونەکەی ئەم بووبوو بە "باشترین ناوەندی دانپێدانراوی کۆمەڵایەتیی ناوخۆی و بووبوو بە یانەو شوێنی دیداری بەرزترین خەڵکی ناو کاربەدەستە گەورەکان و خانەدانان، میوانخانەیەکی کراوە و یانەیەکی توێژینەوەی شوێنەوارناسییش بوو."[١٧٤] بۆیە بەم حاڵەیەوەو بەم کاروبارانەیەوە، کاتێك "ریچ"بوو بە خاڵێکی کاریگەر و پڕ ئیمتیاز بووە مایەی ئێرەیی پێردن و گومان لێکردن لەلایەن سولەیمان پاشا و دوای ئەویش لەلایەن داوود پاشایشەوە.

بە دەستتێوەردانێکی حکومەتی هیندی دوژمنایەتییکردنەکەی سولەیمان بۆ (ریچ) ئەگەر بە تەواوییش کۆتایی پێنەهاتبێ، کەمی کردەوە، چونکە حکومەتی هیندی نارەزایی خۆیی لەو بارەیەوە بۆ بەغدا و بۆ ئیستەنبوڵیش دەربڕی. ئەوەبوو لە رۆژی (٢٥/ کانوونی دووەم/١٨١٠) دا لەگەڵ پاشادا گەیشتن بە رێکەوتنێك، کە تێیدا پاشا ددانی دەنا بە هەموو ئیمتیازاتەکانی پێشووی بریتانیا لە وڵاتەکەدا.[١٧٥]

بەڵام پاشای ئاشتکراوە لە کۆتایی ساڵانی فەرمانڕەوایکردنی و لە کۆتایی ژیانی خۆیشی نزیك بووبۆوە. سوڵتانە نوێ و جەسوورەکەی تورکیا (موحەمەدی دووەم ١٨٠٨ - ١٨٣٩) زۆر لێی ناڕازی بوو، لەبەرئەوەی هیچ داهاتێکی نەدەدا و نیمچە ملهوڕێکیش بوو. لە رۆژی (٥/ تشرینی یەکەم/١٨١٠) بەزۆر لەلایەن نوێنەری ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە، کە لەلایەن چەند توێژێکی بەهێزی ناوخۆییشەوە پشتیوانیی لێدەکرا، لەسەر کارلادرا. کە کورسیی دەسەڵاتیشی بەجێهێشت (مەبەست لە

---

[174] Longrigg, op. cit., 255.

[175] دەقەکەی لە سەرچاوەکەی پەراوێزی نۆزدەدایە، هەمان بەرگ، لاپەڕەکانی ١٠-١١.

سولەیمان پاشایە-و) لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا لەلایەن پیاوەکانی خێڵی (شەممەر تۆگا) وە دۆزرایەوە و کوژرا.

خوێندنەوەی (کایا) بۆ ئەو رۆژگارە یەکلاییکەرەوانە خوێندنەوەیەکی باش و بەرچاوە: بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانی خۆی (جۆن مالکۆلم) لەو کاتەدا لە بەغدا بوو.[١٧٦] ئەو لە رێگادابوو، لە ئێرانەوە بۆ هیندستان کەوتبووەرێ و رێگای کرماشان، بەغدا ، بەسرەی گرتبوو، بەرەو کەنداوی فارس. لە بەغدا بووبووە میوانی ماڵی (ریچ) و لە نزیکەوە ئاگادرای ئەو رووداوانە بوو، کە سولەیمانیان بەو ئاکامە تراژیدییە گەیاند. لەبارەی ئەو چارەنووسەوە کە بە سەر پادشادا هات هەستی بە پەشیمانی دەکرد، چونکە پاشا سەری لێکرابۆوە و بە پێچراوەیی وەکو پەیکەرێك رەوانەی ئیستەنبوڵ کرابوو. بۆیە مالکۆلم دەڵێ :"هەرگیز ناکرێ دیمەنی ئەو سروشتە ببینیت و هەست بە خەم نەکەیت، هەرچی یادەوەریی ئەم دووایین پاشایە هەیە لەناو ئەو هەستکردن بە خەمی ئەو چارەنووسەیەوە وون دەبێ"[١٧٧]

پێدەچێ هەڵسوکەوتکردنی (ریچ) لە تەواوی تەنگژەکەدا بە ساردی حسابی بۆ کرابێ. چونکە سولەیمان داوای هەرجۆرە کۆمەك و یارمەتییەکی بۆ خۆی کردبێ، ریچ وا وەڵامی داوەتەوە، کە دەیەوێ پەیرەوی لە بێلایەن بوونی خۆی بکات. لە راستیدا دەیتوانی هەندێ لە نێردراوەکەی ئاستانە نزیك بکەوێتەوە و داوای بەخشین بۆ پاشا چارەرەشەکە بکات، گەر بیویستبا، لە توانایدا هەبوو، چونکە لەو کاتەدا پەیوەندییەکانی نێوانی بریتانیا و ئاستانە ئەوپەری دۆستانە بوو. هەر ئەم (ریچ)ە، ماوەیەکی پێشتر پەناو داڵدەی وەزیری ناوخۆی حکومەتەکەی ژێر دەسەڵاتی سولەیمانی دابوو،"لەبەرئەوەی ئەم کابرایە لەو کاتەدا، کە لە حکومەتدا بووە و ریچیش ناکۆکیی لەگەڵ پاشادا هەبووە چەند خزمەتی جدییانە و باشی پێشکەشی ریچ کردبوو، بۆیە ئەمیش لە پەیوەندیی تەك حکومەتی بریتانیاوە گلابوو. "[١٧٨] بەپێی ئەو راستییانەی، کە لەبارەی کارو ئەرکەکەی ریچەوە لەناو میسۆپۆتامیادا زانراون و بەپێی پەیوەندییە دۆستانەکەی نێوانی ئاستانەو بریتانیای مەزن لەو کاتانەدا، مرۆڤ دەتوانێ سوك و ئاسان گریمانی ئەوە دابنێت، کە بەپێی هەندێ پێوەر بریتانیا بەشداریی هەبووە

---

176 Kaye, op. cit., II, 41-44.

177 سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٤ و ئەو وشانە لەلایەن نوسەرەوە هێڵیان بەژێردا هێنراوە.

178 سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٢.

لـه رووخانـدنی سولەیمان پاشـادا و ئاكـامی ئەمـەش سـەركەوتنێك بـوو بـۆ دانیـشتوانە ئینگلیزەكانی ناو بەغدا.

لەلایـەن مەندووبەكـەی ئیمپراتۆریـاوە بـەپێی ڕێوشـوێنی لەبەرچـاوگیراو (عەبـدوڵڵا پاشـا—١٨١٠ - ١٨١٣) لـە پۆسـتەكەی سـولەیمان پاشـادا دانـرا و دانانەكەشـی كارسـازاندنێك بـوو لـە نێـوانی ئاسـتانە و فـەرمانڕەوا خۆجێییەكـە (ڕیـچ) دا. تـوانیی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ بریتانییـەكان دروسـت بكـات و بریتانیـاش تـوانیی لەسـایەی فەرمانڕەوایی ئەودا بەشێوەیەك لەشێوەكان پلەوپایەی خۆی لەناو میسۆپۆتامیادا بەهێز بكات. لە ساڵی (١٨١٢) دا ناونیشانی "موقیمی بریتانیا لە بەغدا" گۆڕدرا بۆ "نێـردراوی سیاسـیی بریتانیـا لـە عەرەبـستانی توركیـا" بەمـەش كەرامـەت و گرنگییـەكی زۆرتـری وەرگرت.[١٧٩] لە هەمان ئەو ساڵەدا بریتانیا دوو مەرسـومی لـەلای پاشـاوە بەدەستهێنا، یـەكیان بـۆ ڕێگـە گـرتن بـوو لـە هـەڵهاتنی ئـەو دەریاوانانـەی بریتانیـا لـە بەسـرە دایمەزراندبوون، ئەوی تریشیان بۆ گەڕاندنەوەی ئەو هیندییانە بوو بۆ نیشتمانی خۆیان، كە وەك كۆیلە هێنرابوونە بەندەرەكەی بەسرە.[١٨٠]

ڕاستیی ئەوەی، كە عەبدوڵڵا پاشا دەستنیـشانكراوی سـوڵتان بـوو، ڕێگـەی ئـەوەی نەگرت، كە ڕاپەڕینی كوشندەی لەدژ ئەنجام بدەن. هۆزە بەهێزەكانی (مونتـەفیق)، كـە لەلایەن (حەمموود ئەلسامر)ی سەركردەی داخ لەدڵیانەوە ڕێبەرایـەتی دەكـران، داوایـان دەكرد پاشا لابدرێـت و لەبریی ئەو (سەعید)ی كوڕە بچووكی سولەیمانی گـەورە دابنـرێ بە پاشا. لەمـەوە ململانەیـەكی خوێنـاوی سـەریهەڵدا. عەبـدوڵڵا بـەدیل گـیرا، بـەڵام كـە كوڕەكەی حەمموود لە شەڕدا بریندرابوو مرد، عەبدوڵلاشیان خنكاند.

لەژێر فەرمانڕەوایی (سەعید پاشا) دا، كە بە دوای عەبـدوڵڵا پاشـادا هـات (١٨١٣ - ١٨١٧) وڵاتەكـە لـە خراپیـەوە بـەرەو خـراپتر دەچـوو.[١٨١] فەرمانڕەوایـەكی لاواز و

---

[179] Longrigg, op. cit., 255

[180] دەقەكان لە سەرچاوەكەی (Aitchison) دان، سەرچاوەی پێشوو، بەشی شەشەم، لاپەڕەكانی ١١-١٢.

[181] لەبارەی فەرمانڕەوایيكردنی هەریەكەی پاشاكان: عەلی، سولەیمان، عەبدوڵڵا و سەعید، لە (١٨٠٢ تا ١٨١٧) بڕوانە :

Longrigg, op. cit., 221-238 عەبدوڵڵایان لێ دەربچێت، ئەوانی تر هەموویان بەهێز پاشایەتییەكەیان داگیركردوە و ئیتر لەلایەن ئاستانەوە پشتگیری كراون. لەسـەردەمی مەملوكییەتـدا ئەمە نەریتێكی باو بـوو.زۆری پاشـا مەملوكییـەكان واقعییانـە بـوون و نەكەوتوونەتـە ژێـر قەڵـەمڕەوی فەرمانڕەواییكردنی سوڵتانەوە.

سەرکێش ، خەزێنەیەکی چۆڵ، کۆمەڵە رکەبەرێکی هەمیشە بەهێز و ئامادە، بوونە هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئاژاوەیەکی بەربڵاو و بەهەرحاڵ لە دووایین چرکەکاندا (سەعید) یش گۆڕا بە (داوود ئەفەندی) یەکی چالاك و زیرەك، کە سەردەمی فەرمانڕەواییکردنی مەملووکییەکانی بە ئاکامێکی جوان کۆتایی پێهێنا.

وەك تاکەکەس و وەك فەرمانڕەوایش (داوود پاشا)(١٨١٧ - ١٨٣١) پلەوپایەیەکی بێ وێنەی هەیە لەناو مەملووکییەکانی ناو میسۆپۆتامیادا.[١٨٢] مەسیحییەکی خەڵکی گورجستانە و لەوێش لەدایکبووە. فرۆشراوە و فرۆشراوتەوە و دووایی هەڵگەڕاوەتەوە و بووە بە موسڵمان، دواجار وەك خزمەتکار کەوتۆتە ماڵی سولەیمان پاشای گەورەوە. بە توانا و ئاوەز و ئارامگرتنی خۆی، ئازادیی بەدەستهێناوە. لەناو حکومەتە ناوخۆییەکەدا چەندان پۆستی گرنگ و چاولەسەری بەدەستهێناوە، لە چەك بەکارهێناندا زۆر کارامە بووە، شای نامەنووسین بوو بە (عەرەبی و تورکی و فارسی) بیرکارێکی کارامەش بووە.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (سەعید پاشا)ی پاشاکەی پێش خۆیدا چەندان پۆستی گەورەی پڕکردۆتەوە، وەك (دەفتەرداری و کەهییە). کاتێك بە نەخۆشییەوە سەعید پاشا داوودی بێزار کرد، داوود پاشا کەوتە کاری جدی کردن بۆ ئەوە بتوانێت خۆی جێگەی سەرۆکەکەی بگرێتەوە. لە کاتێکدا، کە ئاژاوە کەوتبووە وڵاتەوە و گۆڕینی حکومەتییش بووبوو بە شتێکی پێویست، ئەم لەبریی هەڵگەڕانەوە و شۆڕشکردن، لە رێگەی یاسایی و ئاساییەوە، کەوتە پەیوەندی کردن بەئاستانەوە. ئەوەبوو بەپێی رێوشوێنی لەبەرچاوگیراو دەستنیشان کرا و لەبەرامبەر بەرەنگاریکردنەکانی سەعیدیشدا خۆیی گرت و ململانەی کرد بەدەستی یەکێك لە ئەفسەرەکانی داوود سەری سەعیدیش قرتێنرا_ و بەزوویی داوود وڵاتەکەی هێنایە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. لە سولەیمان پاشای گەورە تێپەڕێت، لەژێر دەسەڵاتی هیچ پاشایەکدا هێندەی سەردەمی داوود پاشا وڵاتەکە لە ئاشتی و ئاسایش بەهرەمەند نەبووە. بەڵام پەیوەندیی ئەم لەگەڵ بریتانییەکاندا هێندەی پەیوەندیی پاشای گەورە باش نەبووە و بەگشتی پەیوەندییەکی زۆر ناپەسەند بووە.[١٨٣]

---

[182] سەرچاوەی پێشو،لاپەڕەکانی :٢٣٩-٢٤٩ و ٢٦٠-٢٧٤.

[183] لەبەرئەم هۆیەیە، کە لۆنگریگ لەناو کتێبی (For Centuries of Modern Iraq) دا چەند ناحەقییەك بەرامبەر بە داوود پاشا دەکات.

لەسەرەتاوە روانینی داوود پاشا لەبارەی کرێگرتەکەی ئینگلیزەوە لەوێ بەئاشکرا دۆستانە بووە. بەڵام دۆستایەتیی نێوانی پاشایەکی بەهێز و داهێنەر و عەمیلێکی زۆر هەستیار دەبێ هەر کورتخایەن بێت. ریچ لەگەڵ حکومەتی هیندیدا لە پەیوەندیدا بوو، سۆزیشی وابوو، کە رێگەی ئەم حکومەتە بەرەو کەنداوی فارس درێژبکاتەوە (کانوونی دووەمی ١٨٢٠). هەروەها لەگەڵ باڵوێزی بریتانیاش لە ئیستەنبوڵ لە پەیوەندیدا بوو و لەکێش و توانای ئەم باڵوێزەیش لەلای ئاستانە ئاگادار بوو. بۆیە ئەم "دووەمین پیاوی ناو عیراق بوو".[184] بەدیوەکەی تریشدا داوودیش بەتەنگ یەك شتی زۆر سەرەکییەوە بوو، ئەویش ئەوەبوو، کە دەبێ بەڕێوەچوونی دەسەڵاتەکەی لەسەر بناغەی توانا راستەقینەکانی خۆی رابوەستێت. بۆیە بەداخەوە لەسەرەتاوە "ئاگای لە گۆڕانی سەردەمەکان نەبوو."[185]

کەمکردنەوەی چالاکی و کاریگەرییەکانی (ڕیچ) بەڕێگای بۆچوونی ئاشتییانە، کارێکی نائومێدانەبوو. بۆیە پاشا هەڵوێستێکی بەهێزی لەدژی ئەم کرێگرتەیەی ئینگلیز و بریتانییەکان وەرگرت. دەزگایەکی تەواوی پێکهێنا بۆ خەملاندنی کاڵاکانی بریتانییەکان و بە بەکارهێنانی هێز، لە کاڵا و لە پارە باجی خەملێنراوی سەرشتەکانیانی لێدەسەندن. نارەزایی دەربڕینە توندەکانی (ڕیچ) سووربوونی داوود پاشای لەسەر کارەکانی خۆی توندترکرد. ئەوەبوو لە ئاکامدا هەندێکی هێزەکانی پاشا پەلاماری دەزگاکەی (ڕیچ) - یان دا و دوواییش دەستگیریان کرد. هەر بەزوویی حکومەتی هیندستان لەسەر کێشەکە کەوتە جموجووڵ و هاتوچۆ لە نێوان بەغدا و ئیستەنبوڵدا. ئەوەبوو لە مانگی مایسی (١٨٢١) دا رێگە بە ریچ درا وڵاتەکە بەجێبهێڵێت.

لەژێر گوشاری هەریەکە لە ئیستەنبوڵ و هیندستان دەبوو داوود پاش ملکەچ بکات. چونکە لە باشوور و لە رۆژهەڵات و لە باکوورەوە لەلایەن ئەو وڵاتانەوە گەمارۆ دراوبوو، کە تیایاندا کاریگەریی بریتانیا تا ئاستێکی زۆر هەڵکشابوو. لەناو خوودی میسۆپۆتامیاشدا لە دوو دەیەی رابوردوودا بریتانیا بەرژەوەندیی باشیان بۆ خۆیان پێکهێنابوو. بۆیە ئەو دەمە لەڕاستیدا بۆ هەر پاشایەك درەنگ بوو، کە بیەوێ رێگە لە

---

[184] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥٦.

[185] سەرچاوەی پێشوو، دەروازەی پێنجەم، بەشی ٢، لاپەڕەکانی ٢٥٣-٢٦٢.

دامەزرانی کاریگەریی بریتانیا لەناو دۆڵی دوو روباردا بگرێ. بۆیە دوواجار داوود پاشا بەپێی قورسی و هێزی بارودۆخەکە ملی خۆیی چەماندەوە.

ئیدی ئەو مەرجانەی ئیمزاکرد، کە حکومەتی هیندی لەرێگەی نیشتەجێی بریتانیی ناو بەسرەوە بۆ ئاشتبوونەوە پێشکەشی کردبوو.[186]

هیچ پاشایەکی تری بەغدا نییە ئیمزای خۆیی خستبێتە سەر بەڵگەنامەیەك هێندەی ئەمەیان بۆ بریتانییەکان گرنگ بوبێ. ئەم رێکەوتننامەیە مەرجی ئەوەی دانابوو، کە دەبێ ئەو پارەو کاڵایانە بۆ بریتانییەکان بگەرێندرێنەوە، کە بەشێوەی هەرەمەکی لێیان سەندرابوو. ئامانجی سەرەکیی ئەم رێکەوتنە لە بەندی یەکەمیدا جێگیر کرابوو. تیایدا پاشا بەڵێنی ئەوەی دابوو "پەیرەوی بکات لە هەموو ئەو مەرجانەی لەناو پەیماننامە ئیمپراتۆرییەکاندا و لەناو فەرمانە پاشاییەکانیشدا هاتوون، لەسەردەمی کۆن و ئێستایشدا" ئەو "مەرجانەش" هەر ئەوە نەبوون بە تەنها بۆ بریتانییەکان جێبەجێ بکرێن، بەڵکو دەبوو بۆ ئەوانەش جێبەجێ بکرێن، کە لەژێر پاراستنی بریتانییەکاندا بوون، یان هەریەکەی ئەو حکومەتانەی، کە سەر بە حکومەتی بریتانی بوون.(بەندەکانی ٧ و ٨).

ئەوەی ئەوان لەناو هەموو شتەکاندا مەبەستیان بوو، بریتی بوو لە دابینکردنی ئاسایشی ژیان، موڵك، باجی لەسەدا سێ و جگە لەمانەش ئازادیی تەواوی بازرگانی کردن. پەیوەندیی سروشتی لەنێوانی داوود پاشا و (مێجەر تایلەر) ی جێگرەوەی (ریچ) دا دەستی پێکرد. بەڵام هەر زوو بەبەڵگە سەلمێنرا، کە ئیتر نە بریتانییەکان و نە ئاستانەیش تاقەتی ئەوەیان نەماوە لەبەرامبەر کەسێکی مۆدێل کۆنی بەهێزی وەکو داوود پاشادا هەڵ بکەن. ئەوەبوو لە ساڵی (١٨٢٤) دا داوای یارمەتییەکی پزیشکی و دەرمانی لە بریتانیا کرد و داواکەیشی"لەلایەن حکومەتی هیندییەوە" رەتکرایەوە. بە بەهانەی ئەوەی، کە ئەو کۆمەکە پزیشکییانە بۆ پاسەوانە مەملووکییەکانە.[187] بەڵام بێمتمانەیی راستەقینە و جدی لەلایەنی ئاستانەوە بوو. لەو دەمەدا سوڵتان موحەمەدی

---

[186] دەقەکەی لەناو سەرچاوەکەی ئایچیسندایە، سەرچاوەی پێشوو، بەشی شەشەم، لاپەرەکانی١٢-١٤، بەرواری لەسەر نییە. بەڵام بەپێی ئەو راستییانەی لەناو سەرچاوەکەی لۆنگریگدا باسکراون، سەرچاوەی پێشوو، ٢٥٥ن، ٢٥٦ و ٢٦١ زۆر لەوەدەچێ ئەو رێکەوتننامەیە لە ساڵی (١٨٢٢) دا هێنرابێتە ئاراوە. بەڵام لەوەش دەچێت درەنگتر و لە بەرواری (١٨٢٤) دا هێنرابێتە ئاراوە. بەرێکەوت ئەم کابرایە هیچ ئاماژەیەکی بەم بەڵگەنامە زۆر گرنگە نەداوە.

[187] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٦١.

دووەم لەلایەن یەکێك لە پاشاکانی خۆیەوە بەزۆری بەرەنگاری دەکرا و قسەکانیشی پێشێل دەکرا، ئەو کەسەش (محەمەد عەلی) ی میسر بوو. سولّتانیش نەیدەویست ئەم شتە پەرەبسەنێت و پاشایەکی تریش بەکردەوە سەربەخۆ ببێ.

لەمەوە موحەمەدی دووەم داوای لە داوود پاشا کرد، نمونەی حکومەتی مەرکەزی بکاتە سەرمەشقی خۆی و پاسەوانە ئینکیشارییەکانیش (پاسەوانی کۆنی پاشا) بگۆڕێت بە مۆدێلی سەربازی هاوچەرخ. داوودیش یەکسەر گوێڕایەڵی خۆیی پیشاندا (١٨٢٦). بەلاّم سولّتانیش بە ئارام دانەنیشت تا ئەوکاتەی، کە ئەو پاشایەی خۆی هەلّیبژاردبوو لەسەر تەختی پاشایی ناو حکومەکەی بەغدا دانیشت. ئەوەبوو لە کاتێکی درەنگی سالّی (١٨٣٠) دا (عەلی رەزا پاشا) ی بەتوانا و خانەدانی کرد بەو کەسە هەلّبژاردەیەی خۆی دەیەویست. ئەوەبوو پاشای نوێ لە ئیستەنبولّەوە بەسەرۆکایەتیی هێزێکی بچوك لە خزمانی خۆی بەرەو بەغدا کەوتەڕێ، کە بۆ ئەوە پێکەونرابوون ڕێگەکەی لەگەلّدا ببڕن. بریتییش بوون لەو کەسانەی، کە لەناوخۆدا بێزراوبوون، یان بە گوشاری بەلّێن و هەڕەشەنێردرابوون لەگەلّیدا و زۆربەی سوپاکەی ئەویان پێکدەهێنا.

لەو دەمەدا داوود پاشا بەدەست ڕوودانی کارەساتێکی سەختەوە تووشی ساکان هاتبوو. لە مانگی نیسانی سالّی (١٨٣١) دا پەتایەکی زۆر کوشندەی تاعوون دابووی بەسەر میسۆپۆتامیادا. بەتایبەتی شاری بەغدا زیانێکی زۆری لێکەوت، بۆ ماوەی دوانزە ڕۆژ ئەو شارە نزیکەی دوانزە هەزار کەسی لێ مرد. بۆ ڕێگەگرتن لەو مەرگە وێرانکارییەکی ترسناك بەسەر مالّ و مولّکەکاندا هێنرا. هەر بە لافاوی رووباری دیجلە لەماوەی دوو ڕۆژدا هێندە خانو روخا، کە لە هەشت هەزار کەمتر نەبوو. "نەخۆشەکان مردووەکانیان دەناشت و خەلّکی واش هەبوو هێشتا زیندووبوو دەخرایە ناو گۆڕی بە کۆمەلّەوە."[188]

داوود پاشای نەخۆش و زۆر خەمۆك دەبوو، چاوی بە هێزەکانی کەسە نەیارەکەی خۆی بکەوێ و ئەو کاتە هەرچی پاسەوانی تایبەتی خۆی و سەربازی هەبوو لەو تاعوونەدا لە دەستی دابوون. بۆیە دەبوو لەبناغەوە پلانەکانی خۆی بۆ بەرەنگاریکردن دابڕێژێتەوە. بە حوکمی کەمیی کاتەکەی، زۆربەی خەلّکە بەزیندوویی ماوەکەی ناو بەغدا، بەتایبەتی خەلّکە خانەدانەکان لە دەوری کۆبوونەوە.لە کاتی گونجاودا یارمەتییەکی باشی پیاوانی هۆزە بەهێزەکانیشی پێگەیشت. کاتێك لەسەرەتای مانگی

---

[188] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٦٥-٢٦٧.

حوزەیراندا هێزە بێشووماره‌کەی "عەلی رەزا پاشا" گەیشتنە دەروازەکانی باکووری شاری بەغدا، شارەکە خۆیی بۆ نواندنی بەرەنگارییەکی سەخت ئامادەکرد. بەلام عەلی رەزای بە ئاوەز پێیباش بوو چاوەڕوان بکات و هەر لەسەرەتاوە خۆی لەنانەوەی ململانەیەکی وا لابدات، کە لەوانەیە دانیشتنە چاوەڕوانکراوەکەی خۆیی لەسەر تەختی پاشایی لێ تێکبدات. بارودۆخەکەی ناو بەغدا وایلێهات توانای بەرگەگرتنی تێدا نەمایەوە. سوپا گەمارۆدراوەکەش پرزەی لێبڕا، بۆیە ئیتر مەرجی ئەوەیان بۆ دانرا، کە ئەگەر ئەو کەسانەی بەرەنگاری دەکەن، خۆیان نەدەن بە دەستەوە، ئەوا شارەکە دەکەوێتە بەر ئەگەری پەلامارێکی لەپڕەوە. لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوولدا دەستی بەسەردا گیرا و حوکمی داوود پاشایش، کە دووایین پاشای مەملووکی بوو بە کۆتایی گەیەندرا.[189] رووخانی داوود لە سالّی (١٨٣١) دا بوو بە کۆتاییەك بۆ رۆلّی پاشا سەربەخۆکانیش. لەوە بەدواوە بەناو و بە کردەوەیش سولّتان خۆی فەرمانڕەوایی ولاّتەکەی دەکرد. ئیمتیازدان بە بریتانییەکان بە راوێژکردن بە ئەو دەکرا و ئیتر پێویستی بەوەش نەدەکرد پاشا رەزامەندییەکی لاوەکی لەسەر داواکانی بریتانییەکان لەناو میسۆپۆتامیادا دەربڕێ. لێرە بەدوواوە هەر پاشایەکی داخ لەدلّ و بەهێز دەیتوانی گرفت بۆ بریتانییەکان دروست بکات، بەلام کەسێك نەمابوو بتوانێ ئەوەیان بەرامبەر بکات، کە داوود یان سولەیمانی بچووك کردیان، هەر کەس ئەوەی کردبا، یەکسەر لە فەرمانگەکەی خۆی وەدەردەنرا. لەوێ بەدواوە ئیتر سولّتان پاشاکانی دادەنا و لایشیدەبردن.لەبەرئەوەی لە سالاّنی تری سەدەکەدا ئیتر کاریگەریی بریتانیا لەناو ئاستانەدا لایەنێکی زالّ بوو، قەوالّەی نوێی دارشتنەوەی میسۆپۆتامیاش بەڕوون و ئاشکرایی بەپێی خواستی بریتانییەکان بوو. ئەزموونی سەختی داهاتوو بۆ بریتانییەکان بەهۆی سەرهەلّدانی هێزی گەشەکردووی رووسیا لە رۆژهەلاّتەوە پەیدابوو.

---

[189] داوودی بەزیو لەلایەن عەلی رەزای سەرکەوتووەوە رێز و خۆشەویستییەکی بەرچاوی لێگیرا و ئەمجا بەپێی سیاسەتی لێبوردنی مەملووکی بە دەستبەسەری ناردی بۆ ئیستەنبولّ، لەوێش لەماوەی نزیکەی سالّێکدا جارێکی تر لەلایەن ئاستانەوە دامەزرێنرایەوە و بەلام هەرگیز نەنێردرایەوەبۆ میسۆپۆتامیا، بەلّکو کرا بە (والی)ی بۆسنیا، پاشان بوو بە ئەنجومەنی دەولّەت لە ئیستەنبولّ، والیی ئەنکەرە، دواجاریش لەسەر داوای خۆی خرایە پۆستێکی زۆر بەهادار" پاسەوانی شوێنە پیرۆزەکانی مەدینە" و هەر لەوێ مایەوە تا لە سالّی (١٨٥١) دا مرد. سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٢٧٣-٢٧٤.
لەبارەی دوارۆژەکانی حوکمکردنی داوود پاشایشەوە لە بەغدا بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٢٦٧-٢٧٤.

## پاڵنەرەکانی رووسیا و
## دامەزرانی باڵادەستیی بریتانییەکان لە ١٨٣٠- ١٨٦٠

ململانەکەی نێوانی ئینگلتەرە و رووسیا لە رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا لە دەوروبەری ساڵی (١٨٣٠) دا دەستی پێکرد و لە شەست ساڵی پاشتریشدا قەبەتر بووە و لەساڵانی (١٨٩٠) ەکاندا دابەزییەوە و لە دەوروبەری کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بە سەرهەڵدانی ململانەیەکی نوێی تری "ئەنگلۆ-ئەڵمانی" جێگەکەی پێگیرایەوە. کاریگەریی گەورە و زۆر درێژخایەنی خۆیی خستە سەر تەواوی ئەو وڵاتانەی، کە لە رۆژهەڵاتی ئۆرووپاوە دەست پێدەکەن، تا دەگەنە سنووورە رۆژئاواییەکانی هیندستان. رەنگدانەوەی بەرەنجامەکانیشی کەوتە سەر بەشێکی زۆری ئیمپراتۆریای عوسمانی. ئەو بەشانەی ئیمپراتۆریاکە، کە دەکەونە سەر کەنارە رۆژئاواییەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست بەشێوەیەکی بەرفراوان لەلایەن چەند نووسەری گەورەو جۆراوجۆرەوە لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کراوە. تەنانەت ئەو ئەنجامانەشی، کە کەوتنە سەر ئێران و ئەفغانستان، کەمێکیش ئەوانەی سەر هەردوو کەنارەکەی دەریای (قەزوین) لەلایەن چەند دەزگای هاوچەرخەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە. بەڵام میسۆپۆتامیا، کە بەردێکی بناغەی ناوچەی نێوانی رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستە، لەنێوانی زەوییەکانی کەناری رۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست و زەریای هیندیدا گرنگییەکی کەمی پێدراوە. تەواوی ئەم بەشەمان تەرخان کردووە بۆ باسی ئەم چەقە سەرەکییەی ناوچەی ململانەی ئەنگلۆ-ڕووسی.

### ١. چالاکییەکانی رووسیا

ڕووسیا لە سەردەمی پیتەری گەورەوە بە چەند بەهانەی جیاجیا هەوڵی ئەوەیداوە هەرچۆن بێت ئێران لە تەواوی هەرێمەکانی خۆی بێبەری بکات، کە ڕێگاکانی تری بەردەستی شکستیان خواردبێ، کۆی لەوە نەکردۆتەوە پەنا بۆ توندوتیژییش بەرێ. مێژوو گەواهیی ئەوەمان بۆ دەدات، کە بەمشێوەیە و لە قەواڵەیەکی پەیرەودار و جێگیردا، ئەگەرچی لەسەر خۆییش بێت ئەرکی ئەم بێبەری کردنەی ئێران لەلایەن

پیتەری گەورەوە بۆ ئەو کەسانەش گواستراوەتەوە، کە بەدوای ئەودا بوونەتە فەرمانڕەوا. بۆیە(و. پ. ئەندریۆ لە ساڵی ١٨٧٨)[190] و نۆسالٚ پاش ئەویش (گ. ن. کەرزن) هەمان بۆچوونمان بۆ دووبارە دەکەنەوە، کە : "ئەو خەونانەی پیتەری گەورە بەو ئەستەمییە گەلاڵەی کردبوون لە پرۆسەیەکی بە واقعکردنەوەدا سەدهێندەی خۆیان هێنرانەدی."[191] بەلاٚم تا ئێستەش هیچ کام لەو نووسەرانە قسەیەکی وایان لێ وەرنەگیراوە، کە بە بەڵگەیەکی باش و روون بیسەلمێنێ، کە ململانەی ئەنگلۆ-رووسی ئەو رۆژگارەی ئەوان لەلایەن پیتەری گەورەوە رەنگرێژیی بۆکرابێ.

زۆربەی ئەو بانگەشانە یان ئەوەتا پشتیان بە وەسێتنامە قەڵبکراوەکەی(دواکاری و خواستەکەی) (تزاری گەورە) بەستووە، یان ئەوەتا لەوەوە پاڵپشتییان بۆ خۆیان پەیداکردووە. بەندی هەشتەمی ئەم بەڵگەنامە فزووڵییە بەم شێوەیەی خوارەوە دەخوێندرێتەوە:

"لەیادتان نەچێت، کە بازرگانییەکەی هیند بریتییە لە بازرگانیی جیهان، بۆیە دیکتاتۆرەکەی ئۆرووپا بەتایبەتی دەتوانێت بیباتە ژێر رکێفی خۆیەوە. بۆ ئێمەش نابێ هیچ هەلێك بۆ بەرپاکردنی شەڕی دژی ئێران لەدەست بدرێ. بۆئەوەی پەلە لە روخاندنەکەی بکرێ، بۆئەوەی لە کەنداوی فارسیدا پێشکەوتن بەدەستبهێنین، بۆئەوەی بتوانین هەوڵ بدەین بازرگانیکردنە کۆنەکەی خۆمان لەگەڵ رۆژهەلاتدا لەرێگەی سوریاوە دەست پێبکەینەوە."

بێگومان ، ئەو بەندەی چواردەیەمی وەسێتنامەکە، ئەگەر رەسەن بێت(راست بێت-و)، ئەوا دەبێتە بەڵگەیەکی قایلکار بۆ پلانەکانی پیتەر لەبارەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە.[192] بەلاٚم بە روونی دیارە، کە بەڵگەکە رەسەن نییە. کۆنترین باسی ئەم بەڵگەنامەیە لەلایەن (م. لێژە- M. Lesur) ەوە کراوە، کە لە کتێبی ( Des Progre's de la Puissance Russe) دا، کە لە پاریس لە ساڵی (١٨١٢) دا بلاٚوی کردۆتەوە.

---

[190] Andrew, W. P. India and her Neighbours (London, 1878), 320- 326.
[191] Curzon, G. N. , Russia in Central Asia in 1889, and Anglo-Russian question (London, 1889), 413.
[192] Colquhoun, A. R., Russia against India (New York and London, 1900), 238- 242; Sykes, op. cit., II, 244-246.

یۆجین شیولەر(Eugene Schuyler) بەشێوەیەکی گونجاو لەبارەی ئەم کتێبەوە قسەدەکات و دەڵێ: " کتێبێکە تەنها بۆ ئەوە نووسراوە بەهانە بۆئەوە دروست بکات رووسیا لەلایەن ناپلیۆنەوە داگیربکرێت."[١٩٣]

بەلام سەرباری ئەوەش ئەو بەلگەنامەیە گرنگییەکی مێژوویی تەواوی هەیە. لەبەرئەوەی لەسەر ئاستی جەماوەری وەك شتێکی رەسەن پەسەندکراوە، بەتایبەتییش لەلای بریتانیای مەزن بەهۆی هەلگیرسانی شەڕی (کرم- قرم ١٨٥٤-١٨٥٦) و هەلگیرسانی شەڕی تورکیا و رووسیای سالی (١٨٧٧-١٨٧٨)و ئەو بیرۆکەیان لەلا بلاوبۆوە، کە ئامانجی تزار لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئەوەبووە ئەو ئاواتانە بهێنێەدی، کە لە وەسێتنامە هەلبەستراوەکەی پیتەردا ئاماژەیان پێدراوە.

درەنگتر و لەسالی (١٩١٩) دا (ئەنگووس هامیلتن) ئاماژە بە وەسێتنامەکە دەکات و دەلێ رەسەنە.[١٩٤] تەنانەت زۆر نووسەری گومانکاری تریش هەن، کە بە (قەلب-تەزویر) ناوی دەبەن، ئاماژەیەك بەوە نادەن، کە بنەمای ئەو گومانەیان لەکوێوەیە.[١٩٥] هەروەها ئیمپریالیستە پرۆفیشنالەکانی سەدەی نۆزدەیەمینیش، وەك رووسیا و بریتانیا وا راهاتبوون جەخت لەسەر ئەوە بکەنەوە ئەو بەلگەنامەیە وەك نووسراوی رەسەنی پیتەری گەورە پیشان بدەن. سێر پێرسی سایکس درەنگ لە سالی (١٩٢٠) دا دەلێ: "لەوانەشە تەزویرکراوبێ، بەلام بێگومان لەلای ئێرانییەکان و زۆربەی رووسەکانیش، رەسەنە." هەروەها لەسەری دەڕوات و دەلێ: هەمیشە دەتوانرێ وێنەیەکی ئەو بەلگەنامەیە لەناو نامە تایبەتەکانی بالوێزخانەکانی رووسیای سەردەمی حوکمی تزاریدا بدۆزرێتەوە.[١٩٦]

بەدلنیاییەوە چەند نمونەیەکی راستەقینە لەسەر بەرژەوەندیی کۆنی روسیا لەناو رۆژهەلاتدا هەن. لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی شانزەدا (دۆقی گەورەی مۆسکۆ) تەماحی ئەوەی هەبوو چەند رێگایەکی بازرگانیکردن بەناو رووسیای رۆژهەلاتدا بەرەو هیندستان پەرەپێبدات. بەلام تا سەدەی هەژدەیەم هیچ شتێك لەو تەماحانەی ئەوەوە

---

[193] Competent Exposure of its forgery is in Schuyler, Eugene, Peter the Great (New York), II, 512- 514.

هەروەها بڕوانە ئەم سەرچاوەیەش:

Colquhoun. op. cit., 238.

[194] Hamilton, Angus, Problems of the middle East(London, 1919), 62.

[195] Curzon, op. cit., II, Sykes, op. cit., II, 232.

[196] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

سەوز نەبوو.[197] ئەمجا لە ساڵی (١٧١٧) دا پیتەری گەورە سەرکارێکی تایبەتی دامەزراند، کە کوڕی میری قەوقاز بوو، رایسپارد، کە رێگای (ئامو دەریا) تا باکووری ئەفغانستان بگەڕێت و ئاشکرای بکات. بە شەش ساڵ پاش ئەوە هەر هەمان تزار بازرگانێکی ئینگلیز(پیتەر هێنری برووس) ی دامەزراند و دەستنیشانی کرد بۆئەوەی رووپێوی دەریای قەوقازی بۆ بکات. سێیەمین کەسی بەرچاوی راسپێردراو بۆ ئەم مەبەستە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (ئەلیزابیسی تزار) دا بوو(واتە القیصرە الیزابیپ- و)، کە کرێگرتەکەی ئەمیش هەر بازرگیانێکی ئینگلیز بوو(جۆن ئیلتن) و گەشتێکی بەسوودی بۆ هیندستان ئەنجام دا. هەروەها تەنانەت چوو ئامۆژگاریی کۆمپانیای رۆژهەڵاتی هیندستانی ئینگلیزییشی کرد، کە بچن ئاوریشم و کاڵاکانی تریش لە رێگەی رووسیاوە هاوردە بکەن. بەڵام سەرباری ئەوەش پەیوەستبوونی ئیلتن بە کۆمپانی ئینگلیزییەکەوە و خەون و تەماحە تایبەتییەکانی خۆی گومانی خانمی ئیمپراتۆریان جوڵاند و ئەمیش لە ساڵی (١٧٤٦) دا رێگای ناو هەرێمەکانی خۆیی لە بازرگانیکردنی ئینگلیزەکان لەگەڵ رۆژهەڵاتدا قەدەغە کرد.

بەجیا لەم رووداوە ئاشتییانە، کە پێناچێت هیچ ئەنجامێکی گەورەیان لێ کەوتبێتەوە، چەند رووداوێکی شەڕئامێزیش هەبوون، کە هەندێ دەستکەوتی ناوچەییان بۆ رووسیا تێدابوو. هەریەکەی پیتەری گەورە و کاترینی گەورە یەکی چەند شار و ناوچەیەکیان لە باکووری ئێران بۆ خۆیان دابڕی، بەتایبەتییش لەو هەرێمەدا، کە دەکەوێتە نێوانی هەردوو دەریای رەش و قەزوینەوە و پێیدەگوترێ"ترانس قەوقازیا". شارەکانی وەك (ئەستراخان و دەربەند) پارێزگاکانی (داغستان، شیروان، گیلان و مازەندەران)، هەروەها شارەکانی (رەشت و ئەستراباد) هەموویان لەکاتی جیاجیادا و لە سەدەی نۆزدەدا داگیرکران.[198] بەڵام وەك دەرکەوت، ئەمانە دەستکەوتی کاتی بوون و دەبوو بەدوای سەدەی نۆزدەدا بگەڕێنرێنەوە.

باسێکی وا هەیە، کە لە ساڵی (١٧٩١) دا لەلایەن کاترینی دووەمەوە پلانێك بۆ داگیرکردنی هیندستان لەبەرچاو گیرابێ، بەڵام هەرگیز پیادەنەکراوە. یەکەمین پلانی

[197] Birdwood, op. cit., 195-196; Rambaud, Alfred and four other collaborators, The Case of Russia (New York, 1905), 62-63; Colquhoun, op. cit., 2-9.
[198] Rambaud, op. cit., 62-63; Schuyler, op. cit., II, 457-480.

بەناوبانگی داگیرکردنی هیندستان، ئەوەی (پۆڵی یەکەم) بووە، لە مانگی کانوونی دووەمی (١٨٠١) دا، ئەمیش هەر باسی کەشەکەی و سەرنەکەوتنەکەی لەئارادایە.[١٩٩]

ئیتر لە رێککەوتنەکەی (تیلزیت) دا لە (١٨٠٧) دا ناپلیۆن و تزار (ئەلێکساندەری یەکەم) پلانی ئەوەیان دارشت، کە بە هاوبەشی و یارمەتیی ئێران پەلامارێکی هاوبەشی هیندستان بدەن. بەڵام هەر بە ماوەیەکی کەمی پاش رێکەوتنەکە رووسیا و ئێران لێیان لادا و پرۆژەکەشیان هێنایەوە سەر سفر.[٢٠٠]

هەموو ئەو پلانانە بۆ داگیرکردنی هیندستان و پرۆژە بازرگانییەکانی پیتەر و ئێلیزابیس و داگیرکارییەکانی پیتەر وکاترینی دووەم بۆ ناوچەی قەوقاز هەموویان کاری پچرپچر و ئاکامی تیمارکردنی رووداوەکان بوون و بریتی نەبوون لە پلانی تۆکمە و یەکگرتوییەکی پێویستیان نەبوو. هەموویان لە بناغەوە هیی ئەو "رژێمە کۆن"ە بوون، کە لەگەڵ هاتنەسەرکاری (ئەلێکساندەری یەکەم) لە ساڵی (١٨٠١) دا سەردەمەکەی بەسەرچووبوو. لەپاش ئەم بەروارەوە و بەتایبەتییش لەپاش ساڵی (١٨١٣) ەوە سیاسەتەکانی رووسیا لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتێکی ئیمپریالیستییانەو فراوانخوازانە بووە. لەوانەشە ئەمە هەمووی هاوشێوە و رەنگدانەوەی سیاسەتەکانی پیتەری گەورە بووبێ، بەڵام راستەوخۆ لەوەوە پەرەی نەسەندووە.

ئەوە لەلای هەمووان روونە، کە دەرکەوتنی ئیمپریالیزمیەتێکی نوێتری رووسیا لە ئەنجامی ململانەکەی نێوانی (بریتانیا و رووسیا) وە بووە لەناوچەی رۆژهەڵاتدا. بەڵام داخۆ بریتانیا چەند بەزوویی کاردانەوەی لەبەرامبەر ئەو ئیمپریالیزمییەدا نواندووە، ئەوە هێشتا پرسیارێکی کراوەیە و بەدووای وەڵامدا دەگەرێ. لەوانەیە ( D. C. Bougler–بۆگڵە) تاکە کەسێکی بەرپرس بێ پێشنیاری وەڵامێکی لەم شێوەیەی خوارەوەی بۆ ئەم پرسیارە کردبێ و بەباشییش پێکابێتی، ئەوەتا وتویەتی: "تا دەمی

---

[199] بروانە سەرچاوەی سەرەوە، لاپەرە ٤١.

200 هێشتا پلانی تر و درەنگ وەختتریش هەبوون بۆ داگیرکردنی هیندستان، وەك ئەوەی کاتی پەلامارە هاوبەشەکەی رووسیا و ئێرانی ساڵی (١٨٣٧) بۆ سەر (هیرات) و وەك ئەوەی سەردەمی شەری (قرم–١٨٥٥) و ئەو دەمەیش، کە بریتانیا نەیاربوونی خۆیی بۆ هاوپەیمانێتیکردنەکەی رووسیا و تورکیای (سان ستیڤانۆی ساڵی ١٨٧٨) دەربری، بەڵام هیچ کامی ئەم پلانانەش هیچیان لەوانەی پێش خۆیان پتر لێ سەوز نەبوو. :

Curzon, op. cit., 324-330.

ئیمزاکردنی پەیماننامەی گوڵستان هیچ ململانەیەك لەنێوانی بریتانیا و رووسیادا نەبووە." بەڵام قسەیەکی تری هەیە بەڕاستی زۆر گومان هەڵگرە، کە دەڵێت "پەیماننامەکەی ساڵی ١٨١٣ ی رووسیا و ئێران بووە سەرەتای لەدایکبوونی ململانەی ئەنگلۆ- رووسی".[٢٠١]

سەرکەوتنەکانی ئەلیکساندەر تاساڵی (١٨١٣) بەسەر ئێران و تورکیادا، نە بوونە هۆی بەرپاکردنی دووژمنایەتیی لایەنی ئینگلیزی و نە نیازی خراپیشیان لای دروست کرد. چونکە بریتانییەکان پێشوەخت گرفتار و سەرقاڵی ململانەکردنی ناپلیۆن بوون و لەم رووەوە پێیان باش بوو، کە وەك هاوپەیمانێکی چاوەڕوانکراو بڕواننە رووسیا، نەك نەیارێکی گریمانکراو. بۆیە ئەو سەرکەوتنانەی رووسیایان وەك مەترسی بۆسەر بەرژەوەندییە زیندووەکانی خۆیان سەیر نەکردووە. بۆیە کاتێکیش هاوپەیمانێتییان لەگەڵ ئێراندا دروستکرد(لەساڵی ١٨٠١) دا ئازایانە خۆیانیان لەوە لادا بەڵێنی هیچ یارمەتییەکی فریاگوزاری بدەن بە ئێران ئەگەر رووسیا پەلاماری ئێرانی دا. بۆیە کە لە نزیکەی چوار ساڵ پاش ئەو هاوپەیمانێتیکردنەدا ئەو دوژمنکارییەی رووسیاش روویدا، ئەمان بۆ خۆیان لەدواوە دانیشتبوون و ئێرانییەکانیان سپاردبووە دەستی چارەنووسی خۆیان.[٢٠٢] تەنانەت پاڵەوانە بە هەڵپەکەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لەناو ئێراندا(جۆن ماڵکۆڵم) پێشنیاری ئەوەی کرد، کە بە نۆینەدەیی بریتانیا دانووستاندنێکی ئێرانی و رووسی دەست پێبکرێ، بەڵام لەوبارەیەشەوە هیچ دڵنیا نەبوو، کە داخۆ ئەگەر رووسیا ئەو پێشنیارەی رەت کردەوە، دەبێ بریتانیا چی بکات.[٢٠٣] "لەسەر داوای فەرمانڕەوای گشتیی گورجستانی رووسی، سێر گۆر ئۆوزلی هەوڵە باشەکانی خۆیی خستەگەڕو ئەوەبوو لە رۆژی (١٢/١٠ تشرینی یەکەم /١٨١٣) دا پەیماننامەیەك ئیمزاکرا. ئاکامەکانیشی کارەساتباربوون بۆ ئێران، چونکە بەهۆیەوە ئێران ئەم شوێنانەی لەدەست دا: دەربەند، باکۆ، شیروان، شاکی، قەرەباخ و بەشێك لە تالیش و هەروەها هیچ بەهانەیەکیش بەدەستەوە نەهێڵرا لەسەر ناوچەکانی گورجستان، داغستان،

---

[201] Boulger, D. C. , England and Russian in Central Asia (London, 1879), II, 339-340. The Concluding Chapter of vol. II, 337-373, on "the rivalry of England and Russia" is quite instructive.

[202] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٧.

[203] نامەکانی ماڵکۆڵم بۆ لۆرد مینتۆ، سەرکەوتنەکەی هیندستان، ٢٣ ی نۆڤەمبەری ١٨٠٧. بڕوانە: Kaye. Op. cit., I, 397

مینگرێلیا، ئیمێریشیا و ئەبخازیا، هەروەها ناڕاستەوخۆ، بەوەیش قایل کرا، کە هیچ چالاکییەکی دەریاوانی لەناو دەریای قەزویندا ئەنجام نەدات."[٢٠٤]

ئەمانە تێزەکانی ناو پەیماننامەی (گوڵستان) بوون، کە بەهۆیەوە کۆتایی بە شەڕێکی درێژخایەنی نێوانی رووسیا و ئێران هێنرا(١٨٠٤- ١٨١٣)[٢٠٥] ئەم پەیماننامەیە دەروازەی بوونی کاریگەرییەکی رووسییانەی بەسەر ئێراندا ئاوەڵاکرد. بەڵام دەروازەی هیچ جۆرە ململانەیەکی (ئەنگلۆ- رووسی)یشی نە لە ئێران و نە لە هیچ شوێنێکی تری ناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەکردەوە. هەروەها بە ئۆیندەیی و میانەکاریی باڵوێزی بریتانیا لە تارانیش پێکهێنرا و بەتەواوەتییش لەگەڵ سیاسەتە دەرەکییەکانی ئەو دەمەی بریتانیادا تەریب و رێك بوو.

لەودەمەدا بریتانیا بەتەواوی بە ململانەکردنی تەك ناپلیۆنەوە سەرقاڵ بوو، لەچاو ئەم مللانەیەیدا هەموو کاروبارە دەرکییەکانی تر، لەچاو ئەم ململانەیەدا بۆ ئەم وڵاتە شتێکی ناوەندی بوون. ئەو ململانەیەی دژی ناپلیۆن سەرەکیترین سەرقاڵیی زۆربەی ئۆرووپابوو. بە پەیماننامەکەی (کالیش-٢٨/ شووبات-فەبرایەر/ ١٨١٥) هاوپەیمانێتییەکی خۆپاراستن و پەلاماردانیش لەنێوانی (ڕووسیا و پڕووسیا) دا گرێدرا. لە مانگی مارسدا بریتانیای مەزن سویدی لە دژی ناپلیۆن هێنایە ریزی خۆیەوە. لە رۆژی پانزەی حوزەیرانیشدا پەیماننامەیەکی کۆمەکپێکردنی دارایی لەگەڵ هەردوو وڵاتی رووسیا و پڕووسیادا ئیمزاکرد. دوواتریش لە بەرواری (٢٥/ مارس/ ١٨١٥) دا و بە سەد رۆژ هاوپەیمانێتییەکی چوارلایەنە لە دژی ناپلیۆن لە نێوانی "بریتانیای مەزن، رووسیا، پڕووسیا و نەمسا" دا پێکهێنرا. لەو بەروارەش بەدوواوە نیشتەجێکردنی دوژمنکارانەی روسیا لەناو ئەو شوێنانەدا، کە ناکۆکیی هەبوو لەسەریان لەگەڵ هەریەکەی ئێران و تورکیادا[٢٠٦]، بەلای بریتانیاوە لەبریی ئەوەی مایەی نیگەرانی بن، مایەی پەسەندکاری و

[٢٠٤] Sykes, op. cit., II, 314.

[٢٠٥] ئەم پەیماننامەیە لەناو کەمپێکی رووسی، لە نزیکی شاری گوڵستان لەناوچەی قەرەباخ ئیمزاکرا، لە رۆژی (١٢/ ١٠/ ئۆکتۆبەر/١٨١٣) و لە رۆژی (١٥/ ٩/ سێپتێمبەر/١٨١٤)یش لە تەفلیس پەسەند کرا، دەقەکەشی لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا هەیە:

Aitchison, op. cit., XII (1909), Appendix V, PP. XI-XIV.

[٢٠٦] بە گرێدانی پەیماننامەی (بوخارست) روسیا شەڕە پچڕپچڕەکەی خۆیی لەدژی تورکیا کۆتایی پێهێنا، کە نزیکەی شەش ساڵی خایاندبوو. بەپێی ئەم پەیماننامەیەش (باسرابیا)ی کردە پاشکۆی خۆی و تەواوی مافەکانی ناوچەی (ڤالاچی و مۆڵداڤیا)شی بەدەستهێنا.

رەزامەندی بوون. لەمەوە رووسیا دەیتوانی هەموو تواناکانی خۆیی تەرخان بکات بۆ ململانەکردن لە دژی دوژمنە باوەکە. بۆیە سالانی (١٨١٣- ١٨١٥) سەرهەلدانی هیچ جۆرە ململانەیەکی نێوانی "ئەنگلۆ- رووسی" ی بەخۆیەوە نەبینی.

لە چەند سالی پاش ئەوەشەوە، ئەو هاوپەیمانانە لە بنەڕەتەوە سەرقالی سازکردنی (کۆنسێرتێکی ئەوروپییانە) بوون، کە بۆخۆیان سازیان کردبوو، بۆئەوەی بتوانن لەرێگەیەوە پەی بە رووخاندنی بۆناپارت بەرن.

دەبوو سنوورە نوێیەکان و کۆشکە پادشاییە تازەگەرێندراوەکان و بیرویاوەڕە بوژێنراوەکان بپارێزرێن، ئەمە ئامانجی هاوپەیمانێتییە چوارلایەنییەکەی (١٨١٥) بوو. هەر بە هەمان شێوەیش لەناو کۆنگرەی(ئاکیس لا چاپێل – ١٨١٨) و لەوەی(ترۆپاو و لایباخ – ١٨٢٠ – ١٨٢١)دا ، لە هەموویدا بریتانیای مەزن و رووسیا دوو هاوبەش و پێکەوە بوون. تا مانگی تشرینی یەکەمی سالێ (١٨٢٢) کە کۆنگرەی (ڤیرۆنا) سازدرا و لەمەیاندا بریتانیا لە (کۆنسێرت)ەکە پاشەکشەی کرد و لەوکاتەشدا رووسیا لەناو رۆژهەلاتدا هیچ هەنگاوێکی وای هەلنەهێنایەوە، کە ترسی بریتانیا بوروژێنێت.

بەلام لە دەمانی سالانی (١٨٢٠)ەکاندا بوو، کە رووسیا چالاکیی دوژمنکارانەی خۆیی لەدژی تورکیا و ئێران دەست پێکرد و لەمەشەوە ململانەی ئەنگلۆ- رووسی بەراستی سەریهەلدا. لە شەڕی سالانی (١٨٢٦ – ١٨٢٨) دا، کە لە ئەنجامی ناکۆکییەکی سەر سنوورەوە رووسیا لەشەڕی دژ بە ئێرانەوە گلا و لەشەڕەکەشدا رووسیا سەرکەوتنێکی زۆر گرنگی بەسەر ئێراندا بەدەستهێنا. لە دەوروبەری ماوەی یەك سالی تردا رووسیا کەوتە شەڕکردنی دژی تورکیا. لە ئەنجامی ئەم شەڕەشەوە رووسیا کۆمەکی دەبەخشییە هەلگەڕانەوەخوازە یۆنانی و سربی و رۆمانییەکان. تورکەکان بەزین و بەهۆی رێکەوتننامەی (ئەدریانۆپل- ١٨٢٩) وە رووسیا دەستی گرت بەسەر ئەو میرنشینە رۆمانییانەدا، کە لە ئاستانە دابڕێندرابوون. بەلام سەرکەوتنەکەی بەسەر ئێراندا زۆر کاریگەرتر و یەکلاکەرەوەتر بوو لە سەرکەوتنەکەی بەسەر تورکیادا، بۆیە بەپێی بەراورد، رێکەوتننامە رووسی و ئێرانییەکەی (تورکومانچی- شووباتی ١٨٢٨) زۆر سەختتر و توندتر بوو لە رێکەوتننامەکەی (ئەدریانۆپل). لە راستیدا لە تورکومانچی دوو رێکەوتننامە سازکران، یەکەمیان سیاسییانە بوو، ئەوی تریشیان بازرگانییانە بوو. ئەوەی یەکەمیان زۆر گرنگتر بوو. هەر ئەوەشیانە، کە هەموو جارێك وەك رێکەوتننامەی

(توركومانچی) ناوی دەهێنرێ.[207] ئەمەیان ئاشتی و هاوڕێیەتیی لەنێوانی رووسیا و ئێراندا بەرپا كرد و رێكەوتننامە پێشووەكەی (گولستان) یشی بە (بەندی یەكەم و دووەم) ی هەلوەشاندەوە. شارەكانی ئەریڤان و نەخشیڤانیان وازلێهێنا بۆ رووسیا و سنوورەكانی نێوانی رووسیاو ئێران بەو شێوەیە ناسێنران و جێگیركران، كە سنووری رووسیا هەموو ئەو شار و ناوچانەی تێدابێ، كە لە بەندەكانی (٣ و ٤ و ٥)ی رێكەوتننامەكەی گولستاندا وا دیاریكراوبوون، كە لەلایەن رووسیاوە بەدەستهێنراون.[208] ئێران قایل بوو بڕی (سی ملیۆن رۆبلی زیو)وەك قەرەبوو بدات و بەودیویشدا رووسیا (میر عەباس میرزا)ی وەك نوێنەری خۆیان بۆلای كۆشكی ئێران ناساند (بەندی حەوتەم). لە كاتێكدا، كە كەشتییە بازرگانییەكانی هەردوولا بۆیان هەبوو بچنەناو دەریای قەزوین، مەرجی ئەوەشی لەگەلدابوو، كە تەنها رووسیا بۆی هەبێت كەشتیی جەنگیی خۆی بباتە سەر ئەو ئاوە (بەندی ٨).

ئەمانە بەندە سەرەكییەكانی رێكەوتننامە سیاسییەكە بوون. ئەو بەندانەی تر، كە دەمێننەوە هەشت دانەن (هەموو رێكەوتننامەكە پێكەوە شانزە بەندە) و گرنگییەكەیان لەچاو ئەمانەدا، كە باسمان كردن ناوەندیین. هەروەها تایبەت بوون بە مەسەلەكانی وەكو نوێنەرایەتیكردنی دیپلۆماتی، پاراستنی بازرگانی، قەرزدانەوەی ئێران بە رووسیا، نیشتەجێكردن و چارەسەركردنی ئەو پرسانەی، كە لە ئەنجامی هەمواركردنەوەی ناسنامەی هەرێمە تازەكانەوە سەرهەلدەدەن، دیلەكانی جەنگ، ئاسایش و پەسەندكردنی بەلگەنامەكە. پەیماننامە پاشكۆیە بازرگانییەكەیش چەند دابینكردنێكی ئالوگۆڕكراوی بۆ هەردوولا تێدابوو[209] بۆ ئاسانكاری و پاراستنی بازرگانیكردنی نێوانی دوو ولاتەكە و هەردوولا بەلێنیاندا، كە بڕی باجی لە (٥٪) زیاتر لە یەكتر وەرنەگرن. هەروەها ماف و رێگرییەكانی هەریەكەی نوێنەری دیپلۆماتیی رووسیای لەناو ئێران و

---

[207] دەقی رێكەوتننامەكە (بە ئینگلیزی و بە فرەنسی) لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدایە:
Aitchison, op. cit., XII, Appendix VI, PP. XV-XXXIII. Only the political treaty is reproduced in British and Foreign State Papers. Ibid, XV, 669 – 675.

[208] نەخشەیەكی باشی ئەو هەرێمانەی رووسیا بەپێی پەیماننامەكانی گولستان و توركومانچی بەدەستی هێنابوون لەناو سەرچاوەكەی (ئێدوارد هێرتزلت) دا هەیە (پێرشیەن تریتاین) لە نێوانی لاپەرەكانی (١٢٠ – ١٢١) یە. ناوچەی نەخشیڤان لەناو نەخشەكەی ئاپچسندا بە ناوی (ناكیچڤان)ە، سپێلی ئەم سەردەمەی ئەم ناوە ئێستە بەم شێوە یەیە(Nakhichevan):
Times Atlas of the World, Webster's New International Dictionary.

[209] Aitchison, op. cit., XII, Appendix VI, PP. XXVII- XXXIII

نوێنەری دیپلۆماتیەتی ئێرانیشی لە رووسیا دیاریکرد. لەگەڵ ئەمانەشدا بەڵێنی پاراستنی ژیان و ماڵ و موڵکی هەریەکەی هاوڵاتیانی هەردوو وڵاتەکە لەناو هەرێمە هەموارکراوەکانیشدا درا.

بەڕاستی رێکەوتننامەی (تورکومانچی-١٨٢٨) دەروازەی ململانەیەکی ئەنگلۆ - رووسیی لەناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وهەروەها رێکەوتننامەی (ئادریانۆپڵ- ١٨٢٩)یش سەرەتای ململانەیەکی لەناو ناوچەی رۆژهەڵاتدا بەگشتی بەرپاکرد. پاشتریش و تا کۆتایی سەدەکە پێشێلکارییەکانی رووسیا بەرامبەر بە هەردوو وڵاتی ئێران و تورکیا هەر روو لە زیادبوون بوو. بە هەمان شێوە بەرەنگاریکردنی بریتانییەکانیش لە بەرامبەر فراوانبوونی کاریگەریی رووسەکان بەرەو باشووری رۆژهەڵات گەشەی دەکرد.[210]

هیند کەوتبووە سەر رەوتی سەرگەردانی، بۆیە میسۆپۆتامیا وەك یەکێك لە سەرەکیترین ئامانجەکانی بەرچاوی هیندستان، یەکسەر لەچاوی بریتانییەکاندا گریمانێکی تایبەتیی وەرگرت. لە هەوڵیاندا بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەم ئامانجە زیندووە و بۆ پووچەڵکردنەوەی هەر جووڵەیەکی رووسیا بەرەو رووی، بریتانیا دەستی دایە یەکێك لە سەرنجڕاکێشترین پرۆژەکانی ناو مێژووی ئیمپریالیستی. بەناوی ئەنجامدانی روپێوێکی گشتیی دۆڵی دوو روبارەوە برێکی زۆری داتا و زانیارییان لەبارەی ئەم هەرێمەوە کۆکردەوە.

## ٢. دەریاوانیی بریتانییەکان لەناو دیجلە و فوراتدا

وا ناوی رووسەکان دەبرێ، کە لە ساڵی (١٨٢٩)دا سەرەکیترین لایەنی تاقیکەرەوەی وڵاتی هیندستان بووبن:

---

[210] لەبارەی ململانەکانی نێوانی رووسیا و بریتانیاوە لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەم کتێبانەی خوارەوە باشترین سەرچاوەن:
Curzon's , <u>Russia in Central Asia</u>, Bougler's England and Russia, and H. C. Rawlinson's <u>England and Russia in the East</u> (London, 1857)
هەروەها ئەمانەیش چەند سەرچاوەیەکی تری بەهادارن و ئەوەی کۆتایی هەمووشیان تا ئێستە کۆمەڵێك زانیاریی و روونکردنەوەی بە بەهای تێدایە، کە کەڵکیان ماوە, ئەگەرچی بە فزوولەوە هیچ کامی ئەم پێنج سەرچاوەیە وا باس لە میسۆپۆتامیا ناکەن، کە کایەیەکی ململانەکردنی نێوانی ئەو دوو هێزە گەورەیە بووبێت:
Rambaud's <u>The Case of Russia</u>, and Arminius Vambery's <u>The Coming Struggle for India</u> (London, 1885)

"رووسەکان ئێستە کەشتیی هەڵمییان هەیە لەناو ئاوەکانی ڤۆلگا و دەریای قەزویندا، ماوەیەکی کەمی تر دەبینی لەناو ئاوەکانی ئۆراڵ و ئۆکزاسیشدا دەیانبێت و بەپێی هەرچی گریمان هەیە لەناو دیجلە و فوراتیشدا دەیانبێ، هەرشتێك شایانی کردن بێت، ئەوانە لە ئاسیادا دەیکەن و ئێمەیش بە دەستی سپییەوە لێی دەردەچین"[211] ئەم بەیانە جوانە کاتێك راگەیەندرا، کە پێشنیاری ئەوە بۆ هیندستان کرا، کە دەبێ بەرەڤانی و بەرگری لە فورات بکات و دەبێتە کۆنترین بەڵگە لەسەر دەرکەوتنی ململانەی ئەنگلۆ- رووسی لەناو میسۆپۆتامیادا و بەگشتییش لەناو هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لە سالآنێکی درەنگی بیستەکانی (١٨٢٠) دا کۆمپانیای رۆژهەڵاتی هیندستانی بریتانی پرۆژەیەکی بەربلاوی پەیوەندیکردنی(هاتووچۆی) لەناو میسۆپۆتامیادا لەبەرچاوگرت و زۆری نەبرد ئەو پرۆژەیەی ئەو بووە هۆی دەرکەوتنی سەرەتای سیماکانی ململانەیەکی ئەنگلۆ- رووسی لەناو میسۆپۆتامیادا. ئەم پرۆژەیە پاشکۆیەکی رێگە کۆنەکەی (سەری ئومێدی باش) بوو بەرەو هیندستان، شتێکی نوێ بوو، دەتوانرا بۆ رۆشتن بەرەو میسر و بەرەو میسۆپۆتامیاش بگیرێتەبەر.[212] هاندرەی دروستکردنی ئەم رێگایە ئەوەبوو، کە تازە وزەی هەڵمی لەناو رێگای هاتوچۆی ناو ئاودا خرابووە گەڕ. کەشتییە هەڵمییە سەرەتاییەکان بۆ هاتوچۆی ناو رووبارەکان و کەناری دەریاکان لەبار و کرداری بوون، نەك بۆ ئەو گەیشتە دەریاییە ماوە درێژانەی، کە دەبوو کەشتییەکان بەدەوری ئەفریقادا پێچ بکەنەوە. لەگەڵ هاتنی کەشتیی هەڵمی و قاتیرەدا گەشتی خێرا و ئاراستەگیر بوونە خەونێکی گرنگ.

لەمەوە ئیتر ئارەزوویەکی وا پەیدابوو، کە یەکسەر ئاراستەی بازرگانییە پڕسوودەکەی نێوانی ئینگلتەرە و هیندستان بگۆڕدرێ و بە کەشتیی هەڵمین ئەنجام بدرێ، بەناو دەریای سپیی ناوەڕاستدا، یان خوارتر و بەناو دەریای سووردا بۆ رووباری فورات و ئەمجا بەرەو کەنداوی فارسیش. لەباری پێشوودا دەبوو کالآکان بەسەر زەویدا و بەناو خاکی باشووری میسردا بگوێزرێنەوە، هەروەها پاشتر دەبوو لەمیانەی باکووری سوریاوە بگوێزرێنەوە. بەلآم بۆچوونەکان وابوون، کە لە هەرکامی ئەم دوو رێگایەوە

---

[211] Parliamentary Papers, 1834, No. 478, Appendix I, P. 10.

[212] ئەم رێگەیە لەگەڵ سەرەتای سەدەی حەڤدەدا دەتوانرا هاتوچۆی پێدا بکرێ، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٥-١٦.

بەڕێوەبچێت، بازرگانیکردنی نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەباشی رووی لە گەشە کردبوو، تێچوونیشی بەشێوەیەکی بەرچاو کەم بووبۆوە. بۆیە پێش ئەوەی هەر هەنگاوێکی نوێی تر بنرێت، دەبوو لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریی ورد بۆ رێگە ئەڵتەرناتیڤەکان بکرێ، ئەمە کارێکی پێویست بوو.

ملازم (فرەنشیس راودن چیزنەی– ١٧٨٩ – ١٨٧٢) یەکێکی ئەو کەسانەبوو، کە سەودایی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی بەرایی و رووپێوییان هەبوو. ئەم کابرایە بۆ بەشداریکردن لە شەڕی ساڵی (١٨٢٩)ی دژی رووسەکان هاتە تورکیا[٢١٣] لەبەرئەوەی کەم تا زۆر روانینی هەر وەکو روانینی وڵاتەکەی خۆی وابوو لەبارەی ئەو شەڕەوە.. هەر کە ئەو شەڕە کۆتایی هات، ئەو گەیشتە ئەوێ و لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا متمانەی پێبەخشرا و دەستی دایە ئەو کارەی، کە ماوەی تەواوی ژیانی خۆی پێیەوە سەرقاڵ بوو. لەلایەن باڵوێزی بریتانیا لە ناو تورکیا (سێر رۆبەرت گۆردن) وە راسپێردرابوو، کە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری بۆ ئەنجامدانی رێگای بەرەو هیندستان لەنێوانی رێگاکانی میسر و فوراتدا بکات.[٢١٤] ئەمیش بە خۆشحاڵییەوە ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو پەسەندی کرد و راستەوخۆ ملی رێگای گرت بەرەو میسر. لەوێ چاوی بە چەند هاوکارێکی کەوت، کە لەبارەی پرۆژەکەیەوە رێنوێنیی زۆریان پێدا.

هەر پێش ئەوەی ملازم چیزنەی لە میسرەوە بەرەو فورات بکەوێتە جووڵە، بریتانییەکی تر گەشتێکی چوارساڵەی سەرکێشی و گەڕانی بەدرێژایی ئەو رووبارەدا کۆتایی پێهێنا. ئەم کابرایەش ملازم (هـ. ئۆرمسبای)بوو، گەشت و پرۆژەکەشی هێندە تایبەت بوو، کە وایلێکرد لەنێوان ساڵانی(١٨٢٦ – ١٨٣٠)کارەکەی خۆی لە دەریاوانیی هیندستاندا بەجێبهێڵێت. لەوێوە ناوەکەی لەناو لیستی دەریاوانیدا سڕدرایەوە، بەڵام کاتێک، کە ئەنجام و دەستکەوتەکانی گەیشتەکەی ئاشکرابوون، سەرلەنوێ بە خۆشحاڵییەوە دانرایەوە. (Memoir on the Rivers of Mesopotamia، and

---

[213] پاشتر ئەم کتێبەی نووسی:
The Russo- Turkish Campaigns of 1828- 1829: with a View of the Present state of affairs in the East (second ed., London, 1854) ئەم کتێبە زۆر ناوازەیە، لەبەرئەوەی رەنگدانەوەی گۆشەنیگای بەرپرسە هاوچەرخەکانی ئینگلیزی ئەو سەردەمەی تێدایە. بەرگریکردن لە تورکیاو لە دژی رووسیا بەپێویست دەزانرا، بۆئەوەی سەلامەتیی هیندستان بپارێزدرێ، بۆ نموونە بڕوانە لاپەڕەکانی ٣٤٤ – ٣٤٧.

[214] Hoskins, H. L. , British Routes to India (Philadelphia, 1928), 148 – 149.

رۆمانسیەتی (Narrative of a Journey Across the Desert from Hit to Damascus). ئەم گەیشتەی لەلایەن یەکێکی هاورێکانی خۆیەوە بۆمان دەگێردرێتەوە، کە ئەویش (وێلستد)ە و ناونیشانی باسەکەی ئەمەیە (Travels to the City of Caliphs) واتە (چەند گەشتێك بۆ شاری خەلیفەکان) ئەم کارانە هەر ئەوە نەبوون، کە ریکلام (جارِدان) بۆ کارەکانی (ئۆرمسبای) بکەن، بەڵکو چاوی سەرنجیشیان خستە سەر کارە گرنگەکەی (چیزنەی)یش.[215]

کارە دەستپێشخەرییەکەی (چیزنەی) بەشێوەیەکی سەرەکی لە نێوانی حوزەیرانی ساڵی (١٨٣٠) و حوزەیرانی (١٨٣١) دا بەدرێژایی رووباری فورات تا کەنداوی فارس ئەنجامدراوە. لە دوو نامەی یەك لەدوای یەکدا، کە بە بەرواری (١٨٣١/١/٢٥) و (١٨٣١/٦/٣) نووسیوونی (سێر رۆبەرت گۆردن) ی لەبارەی بەرەوپێشەوەچوونی کارەکانی خۆیەوە ئاگادار کردۆتەوە. یەکەمین نامەیان لە (بەغدا) ەوە نووسراوە، کە بەغدا نیوەی رێگەکەی بەرەو باشووری بووە و دووەمیشیانی لە (شوستەر) ەوە نووسیوە، کە شارێکی باشووری رۆژهەڵاتی ئێرانە و دەکاتە دواوێستگەی رێگەی گەیشتەکەی.

تائەوکاتە (چیزنەی) یش چەند چارتێك(نەخشەیەك) ی بەسوودی ئامادەکردبوو برێکی باشی زانیارییشی کۆکردبوّوە.[216] لەناوەراستی ساڵی (١٨٣١) دا دۆزینەوە و ئاشکراکردنە سەرەتاییەکانی تەواو بووبوون و ئامادەش بوو بە راپۆرت بیاندات بە بەرپرسیارانی خۆی لە لەندەن. گەشتی گەرانەوەی بەرەونیشتمانی بەناو ئێران و تورکیادا دەست پێکرد و لە دەوروبەری کۆتایی ساڵی (١٨٣٢) دا گەیشتەوە بریتانیا.

کە گەرایەوە پرۆژەیەکی تایبەتی لە خەیاڵدا بوو. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونە تایبەتییەکانی خۆیەوە گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی، کە فورات گونجاوە و کەڵکی بەکارهێنانی دەریاوانیی هەڵمی دەگرێ. ئامانجیشی ئەوەبوو ئەم بیرەی خۆی کارپێبکات، چونکە پێیوابوو، کە گرنگیی ئەو شتە تەنها هەر بۆ کۆمپانیاکەی رۆژهەڵاتی هیندستان نابێت، بەڵکو بۆ نیشتمانی دایکیشی گرنگ دەبێ. کە گەرایشەوە ئەو داتایانەی لە دەستیدا هەبوون، بە وزەی ماندونەناسانەی خۆیەوە پشتگیریی لێکردن و کاریگەربوونیشیانی سەلماند و بەرپرسیارانیشی پێ قایل کرد. لەماوەی ساڵێکدا

[215] Low, C. R. History of the India Navy (2 vols., London, 1877) 32.
[216] Parliamentary Papers, 1834, No. 478, App. 50- 98.

ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی هیندستان و حکومەتی نیشتمانەکەشی تەواو دڵنیابوون لەوەی ، کە شتەکانی تەواو و ڕێك بوون.

ڕۆژی (٣/ حوزەیران/١٨٣٤) لەناو بریتانیادا ئەنجومەنێك پێکهێنرا بۆئەوەی خەملاندنی بەراوردکاری بۆ بڕی تێچوونەکانی ڕێگاکانی میسر و فورات بەرەو هیندستان بکەن.[217] بڕێکی زۆری زانیاریی گرانبەها لەلایەن ئەنجومەنەکەوە لەبارەی ئەو پرۆژەیەوە کۆکرایەوە و بەناوی (Parliamentary Papers، No. 478) ەوە بڵاو کرایەوە. بێگومان زۆرترینی گەواهیدانەکانی ناو ئەم بەڵگەنامەیە لەبارەی فوراتەوە ئەوانەی (چیزنەی) بوون، بەڵام لەلایەن گەواهیدەرانی ترەوە دیسان گێڕدرابوونەوە.

لەڕۆژی (١٤ ی تەمموز) دا ڕاسپاردەیەکی دەرکرد، داوای دەکرد، کە :"بە زووترین کات و کەمترین دواکەوتن بوودجەیەکی بیست هەزار پاوەندی ئیستەرلینی لەلایەن پەرلەمانەوە تەرخان بکرێ بۆ خستنەبەرکاری ئەو تاقیکردنەوەیە"[218] بەپێی ڕێوشوێنی لەبەرچاوگیراو ڕاسپاردەکە پەسەندکرا و خانەی هیندییش لەلای خۆیەوە بڕی (٥٠٠) پاوەندی خستە سەر بڕە پارە داواکراوەکە.

چیزنەی خۆشحاڵ بوو بەوەی، کە خۆی ڕوپێوی و پێوانە بنچینەیی و پێویست و یەکلاییکەرەوەکانی ئەنجام داوە، بۆیە بەپەلە بوو لە خستنەگەڕی پرۆژەکەدا.

مۆتیڤی ڕوونی "تاقیکردنەوەکە"، کە کۆمەکی پەرلەمان و خانەی هیندیشی بەدەستهێنا بریتی بوو لە ڕاکێشانی ڕێگایەکی نزیك و ئاسانی بازرگانیکردن لەنێوانی بریتانیا و هیندستاندا. لە زۆربەی ئەو گەواهیدان و ڕاپۆرتانەدا، کە دەگەیشتنە ئەنجومەنە پەرلەمانییەکە هەر جەخت لەسەر هەمان ئەم شتە دەکرایەوە. ئەگەرچی ئەمەیان یەکێك بوو لە دوو مۆتیڤی سەرەکی و ئەوی تریان بریتی بوو لە دڵنیاکردنەوەی خۆیان لەبارەی هەر جووڵەیەکی ڕوسیاوە بەرەو میسۆپۆتامیا و بەرەو کەنداوی فارسی. ئەم باسەیان بەڕوونی لەلایەن سەرۆکی بەرپرسی خانەی هیندییەوە گوزارەی لێکراوە.[219] هەروەها لەپێش خانەی هیندییشەوە، بە درێژی لەلایەن خوودی چیزنەیەوە باسی لێکراوە:

---

[217] Parliamentary Papers, (1834), 3rd Series, vol. 24, P. 142.
[218] Parliamentary Papers, (1834), No.478, P. 3-4.

[219] سەرچاوەی سەرەوە , لاپەڕە ٩٥.

ئەوە دیارە، کە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن لە دژی هیند لەمیانەی هەر کامێکی پێنج رێگەکەوە بێت، یان لە سنووری ئێرانەوە بێت، دەبێ زیانێکی گەورەی لەپێناودا بدرێ، ئەگەر زیانی کەشیش بێت (مەناخ)چونکە ئەوە کاروانێکە ماوەکەی نزیکەی (٢٠٠٠ میل — واتە ٣٢١٨,٦٨٨ کیلۆمەتر) دەبێ، بەڵام لەرێگەی فوراتەوە دەتوانین بە خێرایی و کارامانەیش سوپا بگوێزینەوە ناو گۆرەپانی ئۆپەراسیۆنەکان، لەو روانگەیەوەی، کە گواستنەوەکە لەرێگەی فوراتەوەبێ. دیارە پرسیاری پەیوەندیکردنی خێراییش گرنگییەکی کەمی دەبێ، گەر بێین بەراوردی بکەین بە شتێکی بنچینەیی تری وەك گەلاڵەکردنی رێبەستێك لەبەرامبەری رووسیادا، کە ئەو رێبەستییە بەهۆی زۆر فراوانکردنەوە و بەسوودکردنی بازرگانیکردنی خۆمان و کۆلۆنییە رۆژهەلاتییەکانمان و عەرەبستانیش دەبێ.[٢٢٠]

ئەمانە قەواڵەکانی پشتی ئەو روپێوی و ئاشکراکردنانە بوون، کە لەناوچەی میسۆپۆتامیادا لەلایەن (چیزنەی)و کەسانی تری دیار و بەرچاوی بریتانییەوە لە سییەکان و چلەکان و پەنجاکانی سەدەی نۆزدەدا(١٨٣٠ — ١٨٤٠ — ١٨٥٠) ئەنجامدران.[٢٢١]

لە دەمەدەمی کۆتایی ساڵی (١٨٣٤) دا چیزنەی لە دوورگەی (ئەنتاکیا —Antioch) دەرکەوت، لەوێ سەرۆکی دەستەیەکی ئەفسەرانی پسپۆر بوو، هەرچی کەرەستەی پێویستی خۆیشیانە پێیانبوو.[٢٢٢] ئەم ستافە نارەحەتییەکی زۆریان چەشت لەوەدا، کە دەیانەویست پارچە یەدەگەکانی دوو دەزگا هەڵمییەکەی خۆیان ببەنە ناو (بیر- "بیرەجیك"—نزیکترین شوێنە لە سەرچاوەی هەڵقوڵانی فوراتەوە لەناو تورکیادا—و)، کە نزیکترین خاڵ بوو لە فوراتەوە و بۆناو میسۆپۆتامیا. ژمارەیەکی زۆر مانگایان خستە ئیشەوە بۆ گواستنەوەی هەندێ لە پارچە قورسەکان. لە (بیر) دوو دەزگا هەڵمییەکەیان

---

[220] Parliamentary Papers, (1834), No.478, Pp.19 – 20 , App. 16. 72.

[221] زانیاریی زۆرباش لەبارەی ئەم گرنگییێدانانەوە لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدایە:
Low, op. cit., II, 31-50, 408 – 416.

[222] Ainsworth, W. F., A Personal Narrative of the Euphrates Expedition (2 vols. , London, 1888), "Little Officers", opposite P. XIV. Ainsworth was the Surgeon and Geologist of the Expedition. His two volumes are the best single work on the subject.

سازکرد و پێی کەوتنەڕێ بەرەو دیجلە و فورات. بۆیە روپێوییە تەواوەکەیان لەڕاستیدا لە ساڵی (١٨٣٥) ەوە دەستی پێکرد و کرایەوە.

ئەو سێ ساڵەی پاش ئەوەش ، کە تیایدا روپێوییەکان لەسەرخۆ بەرەو خوار و رووەو (بووشەهر) ی لای رۆژهەلاتی کەنداوی فارس خزان، پڕبوون لە مەترسی و شتی خۆش و کاری قوورس. چەندان نەخشەی ورد و زانستییانە ئامادەکران، دیدار لەگەڵ خێڵەکان ئەنجامدرا و زانیاریشیان لەبارەوە کۆکرایەوە. رانانی پڕبەها لەبارەی خاك و خەڵکەکانەوە کۆکرانەوە، بڕێکی باشی مێژووەکەشیان تۆمارکرا.[٢٢٣]

ئەو شتە سەرەکییەی کە سەرخستنی ئەم گەیشتەی مسۆگەر کرد بریتی بوو لە ئارامی بەرگەگرتنی زۆری ئەندامانی ستافەکە و قوربانیدانیان بوو. لەو هەڵسوکەوتانەی ئەو گرووپەدا هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو رەوشت و کاردانەوەیان سەیر و سەرنجڕاکێش نەبوو، کاتێك، کە لە قۆناغە بەراییەکانی روپێوییەکەیاندا بوون کارەساتێکی گەورەیان بەسەرداهات. ئەویش ئەوەبوو هەندێك لە سەرووی (عانە) وە ، یەکێکی دەزگا هەڵمینەکەیان (دیجلە) بە هۆی باهۆزێکی سەختەوە نوقم بوو، چەند کەسی تێدا مردن و بەشێکی زۆری پارە و کەرەستەی گەیشتەکەشیان ژێر ئاو کەوت.[٢٢٤] ئەوانەشی بە زیندوویی مانەوە بوێرانە کارەکەی خۆیانیان درێژە پێدا.

---

[223] لە دوو بەرگی یادەوەریئامێزدا , کە پڕن لە هێڵکاری و نەخشەی جوان، چیزنەی چیرۆکی گەشتەکانی خۆیی گێراوەتەوە، بۆ بینینیان بروانە:

Chesney, F. R. , The Expedition for the Survey of the Rivers Euphrates and Tigris, carried on by order of the British Government, in the Years 1835, 1836, and 1837 (2 vols., London 1850)

.ئەم کارە بۆخۆی ئینسایکلۆپیدیایەکە و لەبارەی تەواوی ناوچەکانی نێوانی دەریای سپیی ناوەڕاست و ئیندیزە. یەك لەسەر سێی تەواوی لاپەڕەکانی ئەو ئینسایکلۆپیدیایە، کە (١٣٦٢) لاپەڕەیە تەرخان کراون بۆ باسی دەستکەوتەکانی گەشتەکەی. دوو بەرگەکەی تری (Euphrates Expedition) ی نوسینی (ئیناسۆرس) ئەگەرچی گرنگییەکی کەمتریان هەیە، بەڵام ئەوانیش بەهای خۆیانیان هەیە و گرنگن بۆ تەواوکاریی ئەم کارەی چیزنەی.

224 خەملاندنی رەسمیی چیزنەی و هێڵکارییەکانیشی لەبارەی ئەم رووداوەوە لەناو سەرچاوەکەی (لۆ) دا هەیە:

Low, op. cit., II, 38- 40.

لۆ نوسیویەتی ئەم کەشە ترسناکە بووە هۆی تیاچوونی دوو ئەفسەر و سیانزە کەسی ئەورووپی و پێنج هاووڵاتیی ئەوێ . بەڵام ئەم زیانانە بەهیچ شێوەیەك نەبوونە هۆی پەکخستنی سووربوون لەسەر تەواوکردنی روپێوییەکە و ئەوەی فوراتیش هەر بەردەوام بوو تا -سەرکەوتن بەدەستهات، سەرباری لەدەستچوونی یەکێك لە هەڵمییەکانیش بە چەند ئامێر و کۆگای گرانبەها و بەشێکی زۆری گرووپەکە و هەموو پارەکانیش.

سەرباری سەلیقەداری و سووربوونی چیزنەی و هاورێکانیشی گەیشتەکەیان ئامانجە سەرەکییەکەی خۆیی نەپێکا. لەڕێگەی ڕوپێوییە ئاگا و هەستیارەکانیانەوە بۆیان دەرکەوت، کە فورات بەپێی سروشتی خۆی کەڵکی دەریاوانی ناگرێ. بۆیە لەمەوە چیزنەییش ناچار بوو، کە بیروباوەڕەکانی پێشووی خۆی بگۆڕێت و بڵێت بەڕاستی فورات ڕێگایەکی گونجاو نییە بۆ بازرگانیکردنی نێوانی هیندستان و ئینگلتەرە.

بەڵام هێشتا شتێك لە کاری ئاشکراکردنەکە مابۆوە، کە تەواو بەڵگەدار و پێویست بو بۆ درێژەپێدان. کاتێك، کە لە ساڵی (١٨٣٧) دا (چیزنەی) گەیشتە بووشەهر و لەوێوە گەڕایەوە بۆ لەندەن بۆئەوەی دووایین ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بکات،[225]، کە ڕۆشت یەکێك لە ملازمەکانی لای خۆی، کە (هـ. ب. لینچ–Lynch) بوو کردی بە سەرۆکی دەزگای هەڵمیی فورات. لینچ لە سەرەتاوە بۆئەوە هاتبوو کار لە ئاشکراکردنی دیجلەدا بکات، ڕێبەریی هاتن و چوونی بەرەوژور و بەرەوخواری ناو ئەم ڕوبارەی کردبوو. هەر لە سەرچاوەکەیەوە تا ناو بەغدا و بە هەمان شێوەیش تا ناو (دەریای عەرەب) لە (١٨٣٧ – ١٨٣٩) پێوابووی. بۆیە لە دەوروبەری ساڵی (١٨٤٠) دا ئەم لینچە و چەند ئەندامێکی تری خێزانەکەی خۆی کۆمپانیایەکی دەریاوانیی بازرگانیکردنیان لەناو دیجلەدا دامەزراندبوو.

سەرباری ئەمانەش ئاشکراکردن و ڕوپێوییەکانی چیزنەی و لینچ هەر بەردەوام بوو لەساڵانی (١٨٤٧ تا ١٨٥٣) پاشکۆیەکی تریشیان بۆ پەیدابوو، کە ئەویش (قوماندار– فیلیکس جۆنز) بوو، لە هێزی دەریایی هیندەوە هاتبوو. بەغدا و دەوروبەرەکەی و شوێنەوارە دێرینەکانی بابل و نەینەوا سیستەمە کۆنەکانی جۆگاکانی ئاودێری، هەموویان ڕوپێو کران و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کرا. یەکێك لە یارمەتیدەرەکانی (جۆنز)، کە ئەفسەرێك بوو ئاماژەی بە هەندێك لەو ئەستەمییە نامۆیانە داوە کە خۆی و هاورێکانی لەسایەیاندا کاریان کردووە. "تەواوی ڕوپێوییەکەی بەغدا لەلایەن خۆمەوە و لەسایەی چەندان کۆت و بەنددا ئەنجام دراون، وەك ئەوەی ژێریەژێر و بەبێ ئاگایی خەڵکی تر کارمان کردبێ، ئەو کاتانە دەبوو هەرشتێکم پێبێ،

[225]" Parliamentary Papers,1837-38, No. 356

" ژمارەیەکی باشی ئاکام و ئەنجامەکانی ئاشکراکردنەکانی چیزنەیمان پێشکەش دەکات. هەروەها ئەو پەیامە گرنگانەشی, کە پەیوەندییان بەو ئاشکراکردنانەوە هەیە پێکەوە کۆکراونەتەوە و لە لەناو " Parliamentary Papers1837, No. 540." دا بڵاوکراونەتەوە

پەیوەندیی بەو کارەوە هەبێ لە کراسە سپییەکەمدا بیشارمەوە، لەو دەمەدا پێنووسێکی خۆڵەمێشیم دەست بکەوتبا باشترین شت بوو بەلامەوە، چەندجار لە شوێنی تەنگەبەردا خۆمانمان دەشاردەوە بۆئەوەی ڕوپێوییەکە بکەین، دەبوو پەنا بۆ هەموو بەهانەیە ببەین، بۆئەوەی گومان لە دەوری خۆمان نەهێڵین."[226]

لە ساڵی (١٨٥٥) دا کە جۆنز وەك نیشتەجێی بریتانیا لە (بووشەهر) دانرا، (کۆماندار سێلبی) لە جێگەکەی ئەو وەك ڕوپێوکار لە میسۆپۆتامیا دانرا و هەر لەناو فەرمانگەکەی ئەوەوە تا ساڵی (١٨٦٢) بەردەوام بوو لە ڕوپێوکردن. سەرەکیترین بەشەکانی ڕوپێویکردنەکەی ئەم بریتی بوو لەڕێگای نێوانی بەغدا و سامەڕا، بەدرێژایی ڕوباری دیجلە. ماوەی کارکردنەکەی ئەم سی ساڵی پڕ لە چالاکیی بەرچاوی بریتانیی ناو میسۆپۆتامیای بەخۆیەوە بینی (١٨٣٠ – ١٨٦٠)و لەم ماوەیەشدا هەرێمەکە ڕوپێویی کرا و بە کردەوەش کایەی کاریی بریتانیا گەڕێنرایەوە ناوی.

### ٣ . میسۆپۆتامیا، وەك کایەیەکی کاریگەریی بریتانیا

بەلێککگیربوونی هەلومەرجەکان، ساڵی (١٨٣٠ – ١٨٣١)سێ گەشەکردنی بەخۆیەوە بینی، کە شایانی تێبینیکردنن و هەریەکەشیان کاریگەریی خۆیی هەبووە لەسەر بەهێزکردنی کاریگەریی بریتانیا لەناو میسۆپۆتامیادا. یەکەمیان ئەوەبوو لەمانگی کانوونی دووەمی (١٨٣١) دا شەپۆلی مەملووکییەکان لەناو میسۆپۆتامیادا بە کۆتایی خۆی گەیشت و وڵاتەکەش خزایە ژێر قەڵەمڕەوی ڕاستەوخۆی ئاستانەوە. دووەمیشیان ئەوەبوو بیرۆکەی بەکارهێنانی ڕوباری فورات وەك ڕێگایەکی کورتی بەرەو هیند پەسەند کرا و سەرەتای کارەکانی خستنەگەڕیشی لەلایەن (چیزنەی) یەوە بەگەڕخرا. سێیەمیشیان ئەوەبوو بێخەمی لەلایەنی ڕوسیاشەوە پەیدابوو، چونکە ئەویش تەنها بەو دەستکەوتە شوومانەی خۆی لە شەڕەکانی دژی ئێران و تورکیاوە (١٨٢٨ – ١٨٢٩)بەدەستی هێنابوون، وازی هێنا.

(لەوانەیە)یەکەمین ئاماژە لەڕێگەی ڕاپۆرتی ڕەسمییەوە بۆ کاریگەرییەکانی بریتانیا لەناو میسۆپۆتامیادا، ئەوەبێ، کە لەلایەن (چیزنەی) یەوە لە بەروارێکی زووی ساڵی (١٨٣١) لە بەغدا ئامادەکراووە. ئەوەتا بە متمانەوە دەڵێت: "کاریگەریی ئێمە لەئێستادا لە پاشالیکی "بەغدا"دا زاڵ و بەرچاوە"[227] ئەم قسەیە بەپێی ڕووکەش کراوە

[226] Low, op. cit., II, 409n
[227] Parliamentary Papers, 1834, No. 478, App. 16, PP 71-72

و زیادەڕەویی تێدایە و ناکاملّیشە. لەوانەیە هەموو ئەوشتانەی لەو وتەیەیدا چیزنی مەبەستی بوو بێت ئەوەبێ ویستبێتی بلّێت، کە ژیان و موڵکەکانی بریتانییەکان لەوێ پارێزراون و لەمەودوا ناچارناکرێن پارەی زۆر بۆ ئەرکی پاراستنی خۆیان بدەن. ئەوەشمان لەیادنەچێ، کە ئەمەش دەستکەوتێکی سەرکەوتنی دیپلۆماتییانەی بریتانییەکان بوو بەسەر دووایین پاشای مەملوکییەکاندا، بۆیە ئیتر تا چاوبڕیکات، حوکمکردنی ئەوان باش بوو.[٢٢٨]

لەنێوانی سالانی (١٨٣٠ – ١٨٦٠) دا کاریگەریی بریتانیا لەناو میسۆپۆتامیادا بەخێرایی گەشەی کرد، دیارە ئەو گەشەکردنەش تەنها لەڕێگەی ئەو ئاشکراکردن و روپێویکردنە پڕ تێچوونانەوە نەبوو، کە تا ئێستا باسمان کردن، بەلّکو لەڕێگەی گەلالەکردن و پێکهێنانی "کۆمپانیای دەریاوانیی هەلّمیی فورات و دیجلە" و بلاوکردنەوەی هەوالّی خەونی راکێشانی پڕۆژەیەکی هێلّی ئاسنین (هێلّی شەمەندەفەر) یشەوە بوو. وەك رامانگەیاند، بوونیادنانی کۆمپانیا دەریاوانییەکە، یان وەك ئەوەی لەناو خەلّکدا پێی ناسراوبوو بلّێین "کۆمپانیای لینچ" ئەنجامێکی راستەوخۆی روپێوکردن و ئاشکراکردنەکان بوو.

(هێنری بلۆوز لینچ) ئەو کەسە بوو، کە لە فەرمانڕەواییکردنی فوراتدا جێگەی چیزنەیی گرتەوە و لەسالانی (١٨٣٧ – ١٨٣٩) دا چەندجار روپێویی روباری دیجلەشی کرد. ئاسە و سەوداییەکی زۆری لەبارەی هەلەکانی بازرگانیکردنی تەك میسۆپۆتامیاوە هەبوو. بە ئامۆژگاری و رێنمایی ئەم بوو (تۆماس کێر لینچ)ی برای لەگەلّ خۆی وئەندامانی تری خێزانەکەیدا لە دەوروبەری سالّی (١٨٤٠) دا خانەیەکی بازرگانی کردنیان لە بەغدا دا دامەزراند.[٢٢٩]

کاتێك، کە حکومەتی هیندی رایگەیاند نیازی وایە(فورات)و یەکێکی تریش لە کەشتییەکانی خۆیان (بەرێزیان–مەسرز) لە میسۆپۆتامیا بکشێنێتەوە، خانەکە کەوتە خۆسازدانی دەست بەکاربوون. لینچ بڕیاریدا ئەو دوو کەشتییەیان لێبکرێت و بیانخاتە ناو چالاکیی بازرگانیی خۆیانەوە. لەبەر زۆر گرنگیی ستراتیجیەتی پڕۆژەکە حکومەتی هیندییش بڕیاریدا پەسەندی بکات و رێوشوێنی گواستنەوەکەیان دەستی پێکرد و

[228] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٨٢ – ٨٦.

[229] Fraser, David, The Short Cut Route to India: the record of a Journey along the route of the Baghdad Railway (London, 1909), 245- 256; Hoskins, op. cit., 423 – 425.

لەناوەڕاستی چلەکانی (١٨٤٠) دا کەشتییەکان تێکەڵێ کارەکە کران. دەزگاکەی لینچ دوو هەڵمییەکەیان لەبازرگانی کردندا خستەگەڕ. لەپڕ بازرگانی کردن گەشەی کرد و لە ساڵی (١٨٦٠) دا بەرپرسیارانی بریتانیاش دانیان بە شێوەکارەکەی (بەڕێزان) دا نا. لینچیش بوو بە "لینچی کۆمپانیای دەریاوانیی هەڵمیی فورات و دیجلە". دەورویەری دەساڵێ پاشتر دوو کەشتییە هەڵمییە کۆنەکەش گۆڕدران بە دووانی نوێتر و لە بریتانیاوە بەرێگای کەناڵە تازەکراوەکەی "سویس" دا هێنرابوون و کۆمپانیاکەش بەردەوام بوو لە کارکردن و سەرکەوتن و بەردەوامیی کارەگرنگەکەی خۆیی درێژە پێدا.

ئەم کۆمپانیایە لەسەرەتاوە کارەکانی خۆیی بەشێوەیەکی یاسایی و بەپێی ئیمتیازی فەرمانێك دەست پێکرد، کە لەسەر داوای حکومەتی بریتانی و بە بەهانەی ئاشکراکردنە بەناوبانگەکەی "چیزنەی" لە مانگی کانوونی یەکەمی (١٨٣٤) دا لەلایەن ئاستانەوە دەرکرابوو.[٢٣٠] ئەم فەرمانە بۆ هەموو فەرمانڕەوا و دادوەرەکانیش بوو، بە درێژایی رێگای فورات، کە دەبوو هیچ لەمپەرێك نەهێننە رێگای دەریاوانی و ئاشکراکردنەکانی بریتانییەکان لەناو ئەو رووبارەدا. بەڵام فەرمانەکە هەر ناوی فوراتی هێنابوو، ئاماژەی بۆ دیجلە نەکردبوو، کەچی بەڕێزانی بنەماڵەی لینچ تەواوی دەریاوانی و بازرگانیکردنی خۆیان و چالاکییەکانیان تەرخان کردبوو بە رووباری دیجلەوە و بەپێی فەرمانەکەی ساڵی (١٨٣٤) ئەوەشیان بە مافێکی دەستووریی خۆیان دەزانی.

دەمێکی زۆر درەنگتر پاش ئەوە و لە ساڵی (١٩٠٧) دا "دێڤد فرێزەر" دەڵێ: "هێندەی من توانیبێتم ئاشکرای بکەم، هیچ ئاماژەیەك بۆ روباری دیجلە لەئارادا نەبووە و تا ئەمڕۆیش نییە. کۆمپانیاکەی لینچ بەپێی فەرمانێك دەریاوانی لەو روبارەدا دەکەن، کە ئاماژەی بۆ روبارێکی تر کردووە، بەڵکو لەوەش واوەتر ئەو فەرمانە مەبەستی لە بنەماڵەکەی لینچ نەبووە، بەڵکو بۆ حکومەتی بریتانیا بووە"[٢٣١]

بۆ تێگەیشتن لەم سەروبن پێکردنە نالۆژیکییە مرۆڤ دەبێ بیر لەوە بکاتەوە، کە بەرپرسیارانی تورك لە ئیستانبوڵ زانیاری و تێگەیشتنی کەمیان لەبارەی جیۆگرافیا و کاروباری ناوخۆی میسۆپۆتامیاوە هەبووە. بۆیە بەلای ئەوانەوە چالاکییەکانی چیزنەی و هەموو روپێوکارانی تر و هەروەها ئەوانەی کۆمپانیاکەی لینچیش هەر هەمان شت

---

[230] Parliamentary Papers, 1837, No. 540, P.5.

و دەقی ئەم فەرمانەش لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدایە:
Aitchison, op. cit., XIII (1909), 16 – 17; Hertslet, Commercial Treaties, XIII, 838 – 839.

[231] Fraser, op. cit., 256.

بووە. هەروەها رەنگە بەلای ئەوانەوە هیچ جیاوازییەکیش نەبووبێت لەوەدا، کە ئایا بریتانییەکان لە یەك روباردا دەریاوانی دەکەن، یان لە هەردووکیاندا؟ ئەگەرچی لەسەرەتاوە رێگەپێدانەکەشیان هەر بۆ یەك روبار کردبوو، کە ئەویش فورات بوو.

چەند ساڵ پاش ئەوەی، کە بریتانییەکان جەختی چالاکییە بازرگانییەکانی خۆیانیان خستبووە سەر دیجلە، رۆژی (١٣/ سێپتێمبەر/ ١٨٤٢) وەزیری گەورەی عوسمانی فەرمان بە پاشای حەڵەب دەکات یارمەتیی کەشتییە هەڵمییەکانی بریتانیا بدات "بۆ مەبەستی بازرگانی تێداکردن روباری فورات بەکاربهێنن ".

ناوی دیجلە و هەروەها فوراتیش، کە پێکەوبن و لەبەردەم هاتوچۆی هەڵمییە بریتانییەکاندا بکرێنەوە، بۆ یەکەمین جار لە نامەیەکدا هاتووە، کە لە بەرواری (٢/٤ نیسان/١٨٤٦)دا وەزیری گەورە بۆ پاشای بەغدای ناردووە. ئەم دوو بەڵگەنامەیە و دەقی رەسەنی فەرمانەکەی ساڵی (١٨٣٤) هەموو پێکەوە لە نامەیەکی گشتگیردا، کە لە بەرواری (١٥/ ١ کانوونی دووەم/١٨٦١) دا لە وەزیری گەورەوە بۆ پاشای بەغدا نێردراوە جەختیان لەسەر کراوەتەوە.[٢٣٢]

دووایین نامەکە ئەو بەڵگانەی تورکیای تێدابوو، کە لەبارەی مەسەلەکەوە بوون و بۆ ئەوە برابوون بەپێی ئەوانە جەخت لەسەر چالاکییەکانی کۆمپانیا دەریاوانییەکەی لینچی پێبکرێتەوە. بەدڵنیایش نە ناوی لینچیان تێداهاتبوو، نە کۆمپانیاکەشی، بەڵکو جەخت کردنەوەکەی لەسەر بریتانییەکان بوو. مافی ئەوەی پێدەدان خزمەتگوزاریی دەریاوانی لە هەردوو رووباری فورات و دیجلەدا دابمەزرێنن. دەبوو ئەو خزمەتگوزارییەش تەنها بە دوو دەزگای هەڵمین بچێ بەرێوە، کە بنکە سەرەکییەکەشیان لە بەغدا بووە. ئەوەش شتێکی سەیرە، بەڵام هەڵەیەکی گرنگیش نییە، کە بەڵگەنامەکەی ساڵی (١٨٦١) بە هەڵە وا باس لە بەغدا دەکات، کە شوێنەکەی بەسەر روباری فوراتەوە بێت. شتێك، کە لەمە گرنگتربێت ئەوەبوو بەڵگەنامەکە مەرجی ئەوەی دانابوو، کە دەبێ ئەو دوو دەزگا هەڵمییە، جیا لە هەر دەزگایەکی تری بێگانە سیستمێکی باجدانی میانرەوانەیان لەسەربێت و نزمتر لەوەی، کە هەموو کاڵاکانی ناویشیان بۆ بەرژەوەندیی تورکیا بێ. هەموو ئەم ئیمتیازاتانەی، کە کۆمپانیای دەریاوانیی هەڵمیی فورات و دیجلە لێی

---

[232] دەقەکان لەم سەرچاوەیەدان:
Hertslet, Commercial Treaties, XIII, 839 – 840, 845 – 846.

بەهرەمەند بوون و بەدەستیان هێنا، کەمتر بوو لەوەی، کە خۆیان ساڵی پێشووتر لەڕێگەی بریکارە شارەزاکانی خۆیانەوە بەدەستیان هێنابوو.

لە سی ساڵی پێش ئاشووبی شەڕی جیهانیدا چالاکییەکانی کۆمپانیاکە چوونە ئاستێکی زۆر گرنگەوە و لەهەمان کاتدا رکەبەریی راستەقینەشیان لەلایەن هاوڵاتیانی ناوخۆوە بۆ دروست بوو.[٢٣٣] ئەگەرچی هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر پتەوبوون و گەشەکردنی کاریگەرییەکانی لەناو میسۆپۆتامیادا، نەك بۆ دامەزرانی سەرەتای کاریگەرییەکە. هەمیشە بەڕێزانی لینچ توانیویانە حساب لەسەر ئەوە بکەن، کە حکومەتی بریتانی پاراستنیان مسۆگەر دەکات. بوونی ئەو بەریەککەوتنەی ئەمان لەگەڵ بەرپرسانی ناوخۆیشدا، کە وایکردبوو ئەمان داوای پاراستنی خۆیان لە حکومەتی بریتانی بکەن، هەرگیز و بەهیچ شێوەیەك کەمی نەدەکردەوە. چونکە بەریەککەوتنەکە بە کاوەخۆیی بەڕێوەدەچوو، بەڵام مایەپووچیش بوو، چونکە حکومەتە ناوخۆییەکە پێی نەدەکرا رکەبەریی لەگەڵ ئەو کۆمپانیایەدا بکات، بەهۆی ئەوەوەی کۆمپانیاکە کاڵا و کەشتیی زۆری هەبوو، رکەبەرییەکەی نێوانیان ناهاوسەنگ و نادادپەروەرانە بوو. کاتێکیش لە ساڵی (١٨٨٣) دا حکومەتە ناوخۆییەکە هەوڵێکی دا بۆئەوەی بڕێك لە چالاکییەکانی کۆمپانیاکە کەم بکاتەوە، بە یەك نارەزایی دەربڕینی "حکومەتی خاوەن شکۆ" هەوڵەکەی پەکخرا.[٢٣٤]

با جارێکی تریش بیڵێینەوە، کۆمپانیاکەی لینچ ئەنجامێکی ئاسایی هەڵمەتی روپێویکردن و ئاشکراکردنەکانی سەر دوو رووبارەکە بوو. ئەو چالاکییانەی کە خۆیان لە بنەڕەتەوە بۆئەوە بوون، کە رێگایەکی کورت لە ئینگلتەرەوە بەرەو هیند دابمەزرێنن و بەناو فوراتدا بڕوات، ئەوەش بۆ ئەوە بوو گریمانی سەرهەڵدانی هەر جۆرە جوڵەیەکی رووسی بەو ئاراستەیەدا بنەبڕ بکەن. لەساڵی (١٨٣٧) دا ئاشکراکردنەکانی چیزنەی ئەوەیان سەلماند، کە فورات رێگەیەکی گونجاو نییە بۆئەوەی ببێتە کایەی

---

[233] لە کۆتاییەکانی سەدەکەدا هاتوچۆی ناو رووبارەکە بەشێوەیەکی باش زیادی کرد، هۆکاری ئەمەش بەرۆونی نۆربوون و گەشەکردنی رەوشی بازرگانیکردن بوو لەگەڵ میسۆپۆتامیادا. بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:

Hall, W. H. (ed.), Reconstruction in Turkey (New York, 1918, 86 -87; Geographical Journal, XLI, 246 – 248.)

[234] Moberly (ed.), The Campaign in Mesopotamia, I, 44; Mesopotamia, Handbook No. 63, P. 30 . On July 28, 1868, the company was granted the right to own real estate anywhere in Mesopotamia. See Hertsle, Edward, Turkey(London,1875),75-77.

خزمەتگوزاریی هەمیشەیی بەلەمە هەڵمییەکان، بەڵام ئاشکراکردنەکانی دیوەکەی تری مەبەستەکەیان بە تەواوەتی سەرکەوتوو بوو. لەم رووەیانەوە بڕێکی زۆر گەورەی زانیاریی گرانبەهایان کۆکردەوە، کە وەك شتێکی گریمانەیی دەتوانرێ لە دژی هەر گریمانێکی هێرشکردنی رووسیا سودی لێ ببینرێ. هەر لە بەر ئەم هۆیەیان بوو، کە پشکنینە بەردەوامەکانی سەر روباری دیجلە هەر بەڕێوەبوون و دەکران، ئەگەرچی ئەم روبارەیان هەرگیز ئەو سیمایەی لێ دەرنەکەوتووە، کە وەك رێگایەکی سەرەکی بۆ بازرگانیکردن لەگەڵ هینددا بەکاربێت.

بەرژەوەندیی بریتانیا لە میسۆپۆتامیادا یەکەم جار و سەرەتایش هەر ستراتیجییانە بووە. بەرژەوەندیی ئابووریی بریتانی لەم وڵاتەدا، لەگەڵ ئەو گریمانەیەشدا، کە لەساڵی (١٨٨٠)وە گرنگییەکی گەورەتری وەرگرتووە، هەرگیز لەوە کەمتر نەبووە، کە ئامانجێکی ستراتیجییانە بووبێت. ئەم راستییانە کاتێك باش ئاشکرابوون، کە کەوتنە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەر فورات بۆئەوەی بزانن بۆئەوە گونجاوە ببێتە رێگای بەرەو هیند، جارێکی تریش بەوە توختربۆوە، کە باسی پرۆژەی هێڵی ئاسنینی فورات هاتەپێشەوە. ئامانجی ئەم پرۆژەیەیان ئەوەبوو هێڵێکی سکەی شەمەندەفەر دابمەزرێنرێ، کە لە شوێنێکی کەناری ئاویی سوریاوە دەست پێبکات و بە دۆڵی فوراتدا بڕوات و لەوێشەوە بچێتە خوارەوە بۆسەر خاڵێکی کەنداوی فارس. بەمەش دەریای سپیی ناوەڕاست و زەریای هیندی پێکەوە دەبەستێتەوە.ئەم پرۆژەیە یەکەم جار لە ساڵی (١٨٥٧) دا هێنرایەپێشەوە، ئەو کاتەی، کە "هەڵگەڕانەوەکەی سیپۆی " دەستی پێکرد(هەڵگەڕانەوەی سیپۆی، واتە شەڕی رزگاریخوازیی هیندستان١٨٥٧ – ١٨٥٩ – و) و "شەڕی قرم" یش بریتانیای ناچارکرد بیر لە رێگایەکی خێراتری دەستگەیشتن بە هیندستان بکاتەوە، بۆئەوەی ئیمپراتۆریاکەی خۆیان لەناو رۆژهەڵاتدا لە دەستی رووسەکان بپارێزن. بەڵام سەرباری ئەوەی بە هەڵپەش بوون بۆی و پسپۆڕانیش هاندەربوون لەبارەیەوە، کەچی نەتوانرا لە زەمینەی واقعدا جێبەجێ بکرێ. چونکە دامەزرانەکەی پێویستی بە کۆمەکی حکومەت هەبوو، ئەو کۆمەکەش دەست نەدەکەوت. حکومەتی بریتانی نە نیازی ئەوەی هەبوو خەرجیی پرۆژەکە دابین بکات[٢٣٥] و نە ئامادەش بوو بەشداری لە دابینکردنی لایەنە ئابوورییەکانی جێبەجێکردنیدا بکات.

---

[235] باسێکی پوخت و باشی لێکۆڵینەوەی هێڵی ئاسنینی دۆڵی فورات لەناو ئەم سەرچاوەیەدا هەیە:
Hoskins, op. cit., 331 – 342, 446 – 450.

هەریەکەی (لۆرد پالمەرستن) و (سەرەك وەزیران) یش خۆیانیان دابووە دەستی ئەو گوشارانەوە، کە ناپلیۆنی سێیەم دروستی کردبوون و ناپلیۆنیش لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نەبوو، هێڵێکی ئاسنینی بریتانی بەناو سوریادا رابکێشرێ. لەبەرئەوەی خەڵکە فەلەکانی ئەو ناوچەیەی دەبوو هێڵەکەی پێدابڕوات لەژێر چەتری پاراستنە بەناوبانگەکەی فرەنسییەکاندا بوون و خودی هەرێمەکەش بە کایەیەکی ژێر کاریگەریی بالادەستی فرەنسییەکان دەزانرا. چونکە پەیوەندییە ئەنگلۆ- فرەنسییەکان لەو دەمەدا هێندە باش بوون، نەدەکرا بە دروستکردنی پرۆژەیەکی خەملێنراوی لەو شێوەیە، کە نیمچە سادەیشە، زیانی پێبگەیەندرێ. لە کاتی شەڕی (قرم) دا (١٨٥٤ - ١٨٥٦) بریتانیا و فرەنسا سوپای هاوبەشیان هەبوو، لە دژی روسیا شەڕیان دەکرد. درەنگتریش لە ساڵی (١٨٦٠) دا "پەیماننامەی بازرگانیی کۆبدین" لەنێوانی ئەم دوو وڵاتەدا بۆ بەهێزکردنی هاوڕێیەتییەکەیان گرێدرا.

ئەم پرۆژەیە بۆماوەی نزیکەی پانزە ساڵ پەکیکەوت. بەڵام وادیارە لەو دەمەدا، کە(لۆرد پالمەرستن) جارێکی تر بۆتەوە بە سەرەك وەزیران(١٨٥٩ - ١٨٦٥)جارێکی تر پرۆژەکەیش گرنگیی خۆیی پەیداکردۆتەوە. لەو کاتەدا بەشێوەیەکی کاتی و زۆر بە گرنگییەوە کەناڵی سویس بوونیادنرا و لەرۆژی (١٨٦٩/١١/١٧) دا کرایەوە. لەبەرئەوەی، کە تازە کرابۆوە وا دەزانرا یەکسەر و بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە پێویستبوونی کردنەوەی ئەو پرۆژەی هێڵە ئاسنینەش دەهێنێ. بەڵام هاندەرانی پرۆژەکە هەر نائومێد نەبوون، دەیانگووت ئەو کەناڵە لەوە لاوازترە بۆ شتێکی وا گرنگ پشتی پێببەسترێ و هەر دوژمنێك دەتوانێت بە نوقمکردنی یەك دانە یان لە دانەیەك زیاتری کەشتییەك تێیدا پەکیبخات. لەرووی خێرایی پەیوەندیکردنەوە هێڵە ئاسنینەکە باشتر و کاراترە لە کەناڵەکە. دواجار کەناڵەکەش پرۆژەیەکی فرەنسی بوو.

بۆیە کاتێك، کە بانگەشەکارانی پرۆژەکە لە ساڵانی (١٨٧١ - ١٨٧٢) دا دووەمین هەڵمەتی سەرەکیی خۆیانیان دەست پێکردەوە، کەناڵی سویس تاکە گرفتی بەردەمیان بوو، کە جەختی لەسەر بکەن، بۆیە چالاکانە مامەڵەیان لەتەکدا کرد. لەمە تێپەڕبێت، هەموو بەهانەهێنانەوە درێژو گشتگیرەکانیان، هەر ئەوانە بوون لە کاتی یەکەمین هەڵمەتیاندا بەکاریان هێنابوون. ئەوان دەیانگووت بوونیادنانی ئەو هێڵە ئاسنینە گرنگییەکی زۆر گەورەی دەبێت بۆ بریتانیای مەزن. رێگەی بەرەو هیند کورت دەکاتەوە. دەبێتە رێگرێکیش لەدژی ئامبازبوونی رووسیا بە میسۆپۆتامیا. دەبێتە

هاندەری بازرگانیکردنی بریتانیا لەگەڵ ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا.[٢٣٦] جارێکی تریش جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە، کە بەشداریکردنی حکومەت بۆ سەرخستنی پرۆژەکە پێویستە، بەڵام دیسان ئەم پێشنیارەش هەر رەتکرایەوە. حکومەتی بریتانی ئامادەنەبوو بەرگەی ئەو مەترسیە بگرێت، بۆیە هەڵمەتی دووەمیشیان سەرکەوتنێکی لەوەی یەکەمیان زیاتری بەدەست نەهێنا. بۆیە پرۆژەکە هەر وەك پێشنیار مایەوە، تا لە سالانی(١٨٨٠)کاندا، بە پەیدابوونی پرۆژەیەکی هێڵی ئاسنینی بەغدا، کە لەلایەن ئەلمانیاوە بوودجەی دابین دەکرا، ئەو هەڵوەشێنرایەوە.

خەملاندنی ئەوەی کە بوونی ئەو پرۆژەیە ئەگەر ئەنجام بدرایە، تاچەند مایەی سوودگەیاندن دەبوو بە بریتانیای مەزن، شتێکە لە دەرەوەی ئامانج و کایەی کارکردنی ئەم چیرۆکەی ئێمەوەیە. بەرژەوەندیی ئێمە لەهێنانەوەی ئەم باسەدا لەوێدایە ئەو مشتومرە درێژانەی پێ بهێنینە بەرباس، کە لەناو خەڵکە کاربەدەست و کاراکانی ناو بریتانیادا لەبارەی ئەو پرۆژانەوە کراون، کە ویستراوە لەرێگەیانەوە میسۆپۆتامیاش ببرێتە ناو کایەی کاریگەریی بریتانیاوە و بەرژەوەندییەکانی بریتانیای لەناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا پێ سەربخرێ.

"سێر . و . پ. ئەندرێ" لە سالی (١٨٧٧) دا ووتویەتی "بیست ساڵ بەسەر ئەوەدا تێپەڕیوە، کە گەورەترین و کاریگەرترین شاندی نێردراو لەبارەی ئەم پرۆژەیەوە گوشاریان خستە سەر لۆرد پالمیرستن. پاشان لە سالی ١٨٧١ و ١٨٧٢ یشدا کۆمیتەیەك پێکهێنرا، کە ئەندامەکانی لەلایەن ئەنجومەنی گشتییەوە هەڵبژێردرابوون و لەلایەن وەزیری دارایی ئێستاشەوە سەرۆکایەتیی دەکرا، هات جەختی لەسەر هەموو هەڵەکان کردەوە و پاشان داواشی کرد پرۆژەی بوونیادنانی هێڵی ئاسنینی دۆڵی فورات دەست پێبکرێ، دەست پێکردنەکەی لە بەندەرێکی سەر دەریای سپیی ناوەڕاستەوە بێت و ببەسترێتەوە بە بەشی سەرەوەی کەنداوی فارسەوە، حکومەتیش لەبارەی بڕیاری خۆیەوە پشتی بە بەڵگەکانی ئەم کەسانە بەستبوو: لۆرد ستراتفۆرد دی رێدکلیف، لۆرد

---

[236] Parliamentary Papers, 1871, No. 386; 1872; No. 322; 1872, No. c 534.
–یەکەمین و دووەمینی ئەم بەڵگەنامانە کەرەستەیەکی بەڵگەنامەیی باش لەبارەی هێڵە ئاسنینەکەی دۆڵی فوراتەوە پێشکەش دەکەن. ئەوەی دووەمیان تاکە بەڵگەی تێر و تەواوە لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە. سێیەمیان (ئەوەی ژمارە س. ٥٣٤) بریتییە لە کۆی راپۆرتە کونسڵییەکانی تایبەت بە رێنماییکردن لەبارەی پرۆژەی هێڵە ئاسنینەکەوە.ئەم سێ نامانە پەردەپۆشی حسابی تەواوی پرۆژەکە دەکەن، لە هەڵمەتەکەی پێشووی سالی (١٨٥٧)یەوە.

ستراتنارین، سێر بارتڵ فرێر، سێر دۆناڵد مەکلیود، سێر هێنری گرین، مستەر، س ، لاینگ و سێر هێنری تایلەر، کە ئەمانە هەموویان لە دەستەکەی ژەنەراڵ چیزنەیی ئاشکراکەری سەرەکیی ڕێگاکە بوون. لەگەڵ دوو ئەفسەری تری پشکینکار، کە ئەوانیش "ئەدمیراڵ چارلۆود، ر، ن." و" مستەر، و، ئاینسۆرس" بوون و هەروەها هاوکارەکانیشیان بریتی بوون لە "سێر جۆن مەکنەیڵ"، "مستەر تێلفۆرد مەکنەیڵ"و "مستەر ماکسوێڵ، س. ی"یش، کە کاری ڕوپێوییەکانی کردوە و لەبارەی چەندین خاڵی سەختی ناو ئیشەکەشەوە راپۆرتی ناردووە."کاپتن فلیکس جۆنز" کە ڕوپێویی تەواوی ڕێگەکەی کردووە لەسەرووی کەنداوی فارسەوە تا دەریای سپیی ناوەڕاست. ئەگەر بڕیاری ئەم ڕێگەیە لە دەستی خەڵکانێکی تری جگە لە بریتانیادا بووایە، بۆنموونە وەکو رووسیا، ئەوا دەکرا کەناڵی سوێس بگۆڕدرایە و ڕێگەکەش رادەکێشرا و بەناو ئێرانیشدا درێژەی پێدەدرا بۆ بەلوچستان و لەوێشەوە بۆ هیند دیارە ئەمەش بەهۆی بوونی ئەو هەموو زرێپۆشە بریتانییەوە لەناو کەنداوی فارسدا کارێکی ئاسان دەبوو."[237]

زۆریی ژمارە و بەرزیی پلەی ئەو کەسانەی یارمەتیدەری پرۆژەکە بوون، زۆریی مشتومڕو نووسینە پەرلەمانییەکان لەبارەیەوە، زۆریی وانەکان و ئەو چالاکییانەی تریش، کە پەیوەندییان پێوەی هەبوو، تێکچڕژاویی ئەو راگەیاندن و بانگەشانەی لەبارەی میسۆپۆتامیاوە پێکهاتن، وایان کرد، لەناو هەموو ئەو شوێنانەی تردا، کە لەژێر کاریگەریی بریتانیادا بوون، تەنها میسۆپۆتامیا لەناو وڵاتی بریتانیادا سەودایییەکی باشی لەبارەوە پەیدابێ. بۆیە سەرنەکەوتنی پرۆژەکەش بەمانای پاشەکشە کردنی ئەو سەودایییە نەهات. زۆرجار باسمان کرد، کە ئەو کەسانەی، کە لەناو سەرکردایەتیی حکومەتی بریتانیدا بوون، لەوانەشە بەهۆی سەرسەختییانەوە بووبێ، کە لەو بڕوایەدابوون، لەوانەیە ئەو پرۆژەیە ئەو بودجەی نەهێنایە، کە بۆ جێبەجێکردنەکەی پێویست بوو. ڕۆژی (١٠/ئاب/ ١٨٥٧) دا لۆرد پالمەرستن ووتی: " وەك ووتم، بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانیوە _ئەگەرچی وەك خەڵکێکی ناپسپۆر و بێ پیشەوەرییش قسەی تێدادەکەم_ ، کە من پێموایە پلانەکە شتێکی خەیاڵییە، لەبەرئەوەیە من لەوبڕوایەدابووم

---

[237] Andrew, India and Her Neighbors, 298.For names and titles of that "Largest and most influential deputation" which pressed the project upon Lord Plamerstone, in 1857, see Ibid, 368 – 369. Valuable documentary excerpts on the Euphrates Railway, are in ibid, Appendix E, 368 – 379. Sir W.P. Andrew was the originator of the project, and the Chairman of its promoters. His works are the best on the subject.

له رووی بازرگانییەوە مایەی خۆی دەرناهێنێتەوە و ناڕەزاییەکی سیاسییانەی توند دەهێنێتەئاراوە.[238]"

ئەو ئەدەبیاتە زۆروزەوەندەی لەبارەی یارمەتیدانی پرۆژەکەوە بە بەرهەم هاتوون گومانێکیان لەوەدا نەهێشتۆتەوە، کە میسۆپۆتامیا چ گرنگییەکی بۆ بەرگریکردن لە ئیمپراتۆریای بریتانی و پەیوەندییە ئیمپراتۆرییەکانیشی هەبووە. بەڵکە لەوەش زیاتر نوقلانەی ئایندەیەکی ئابوریی باشیشی هەبووە بۆ وڵاتەکە و لەوانەش بوو بەشدارییش بکات لە سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئاڵوگۆڕێکی باش لە بازرگانیی ئینگلیزی، میسۆپۆتامیاییدا. بۆیە لەگەڵ سەرنەکەوتنی پرۆژەکەدا بەهانەی بوونی بەرژەوەندیی ڕێگایەکی خێرای پەیوەندیکردن و بازرگانییش لەمیانەی میسۆپۆتامیاوە ئەو کێش و قورسییەی نەما. بەڵام لەڕووی بەرگریکردن لە ئیمپراتۆریاکەوە ئەم ناوچەیە هەر هێز و بەهانەی گرنگی خۆیی هەبوو.

"بەهای سەربازی و سیاسییانەی هێڵی فورات، بۆ هەموکاتێك بابەتێکی گرنگە و پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە بەرگریکردن، نەك تەنها هەر لە تورکیا، بەڵکو بۆ ئێران و تەواوی ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوانی دەریای سپیی ناوەڕاست و ، قەزوین و زەریای هیندیش دەبێ وەك گرنگترین شوێن چاوی لێبکرێ. "

مەبەست لەم ووشەی "بەرگریکردن" ەی لەم پەرەگرافەدا بەکارهێنراوە، ڕێگرتنە لە گریمانی هەر دوژمنکارییەك لەلایەن رووسیاوە دەربکەوێ و لەساڵی(١٨٧٧) دا لەلایەن (سێر. و. پ. ئەندرێ) وە بەکارهێنراوە،[239] و پێشتریش هەر لەلایەن خــــــــــۆی و

---

[238] ئەو وشانە لەلایەن نوسەرەوە هێڵیان بەژێردا هێنراوە: بڕوانە:
Parliamentary Debate, 3rd series, CXLVII, 1681
. گلادستن ماوەیەکی زۆر بەشداریی مشتومڕەکانی ناو پەرلەمانی کردبوو، بڕوانە ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە، مشتومڕە درێژەکانی ناوو پەرلەمانی ساڵانی (١٦٥٢ - ١٦٨٢) ئەم کابرایە لەکاتی بەڕێوەچوونی دووەمین هەڵمەتی پرۆژەکەدا سەرەکوەزیران بووە. بەڵام هەڵسوکەوتی ئەمیش لەوەی پاڵمەرستن باشتر نەبووە و ئەمیش هەر خەڵکێکی ناپسپۆر بووە و ناپیشەوەرانە قسەی تێداکردووە. سەرسەختتییەکەشی لە ڕێگەگرتن لەو تەرخانکردنی کۆمەکی حکومی بۆ پرۆژەکە لە پاڵمەرستن کەمتر نەبووە.

[239] Andrew, op. cit., 327 – 328.

هاوکارەکانیەوە لەساڵی (١٨٥٧) دا بانگەشەی بۆکراوە.[٢٤٠] ئەوە درێژدادرپییەکی بێزارکارانە دەبێ، گەر بێین، هەموو بۆچوونی ئەو "پسپۆران"ە، بهێنینە ناو باسەکەوە، کە لەبارەی ئەم کێشە زیندووەوە هەمان بۆچوونیان هەبووە. خوودی ئەندرێ وا راهاتبوو بۆچوونی بەرپرسیارێکی سەربازی دووپات بکاتەوە، کە (فیلد مارشال لێفتنەنت- بارۆن کوهن ڤۆن کوهننفێلد)ی وەزیری جەنگی نەمسابوو.

لە دەمێکی زووی ساڵی (١٨٥٨) دا ڤان کۆهننفێلد لەم رووەوە قسەی خۆیی کردبوو.[٢٤١] وتبووی، کە سەرەکیترین چالاکیی فراوانخوازیی رووسیا لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆئەوەیە بگاتە ناوچەی کەنداوی فارسی. دیارە هەوڵ بۆئەوەش دەدات، لەرێگەی ئامبازبوونی بە قۆناغەوە بەم ئامانجەی خۆی بگات. ئەو دەیەوێ هەرێمە ئەرمەنییەکان بلکێنێ بە خاکی خۆیەوە، بەسەر کیف و بوخارادا زاڵ ببێ، قەڵەمڕەوی خۆی بگەیەنێتە باکووری ئێران. ئەمجا لەوێشەوە یەکێکی ئەم رێگایانە دەگرێتەبەر بۆ گەیشتنە ناو کەنداوی فارسی:

١. رێگای قارس بەرەو دۆڵی فورات و کەنداوی فارس.

٢. رێگای ئەریڤان، لەدەریاچەی وانەوە بۆ موسڵ و بەناو دۆڵی روباری دیجلەدا، بۆ میسۆپۆتامیا و لەوێشەوە تێکەڵی ئەو رێگەیەی یەکەم دەبێتەوە بەرەو بەغدا.

٣. رێگای تەبرێز بۆ شوستەر لە دۆڵی کەرەچەوە و لەوشوێنەوەی، کە دەگات بە

٤. ئەو رێگایەی دەگاتەوە بەتاران، لە ئیسفەهانەوە بۆ شوستەر و ئەمجا لەوێشەوە بۆ کەنداوی فارس.

---

[240] Ibid, 372 – 375: "Letter form W. P. Andrew Esq. to the Right Hon Viscount Palmerstone , K. G.," London, Jine 30, 1857

ئەم تێبینییە گرنگە لە کۆتایی ئەم نامەیەدا دەردەکەوێ:"من پێویستە بڵێم, کە بە گشتی بڕوام وایە، کە بەدڵنیاییەوە ئەو رێگای فوراتە، ئەگەر لەلایەن بریتانیاوە رەتکرایەوە، دەکەوێتە دەستی خەڵکانی ترەوە" ئەوەش روونە، کە ئەو دەستانەی ئەم باسی کردوون دەستی ئەڵمانییەکان بووە، نەک رووسەکان.

[241] قسەکەی بە درێژی لەو سەرچاوەیەی پێشوودا هەیە: لاپەڕەکانی ٣٢٨ – ٣٣٠. پێش نوسینیشی خودی ئەندرێ ئەم ووتەیەی ئەمی لە وانەیەکیدا وتبووە، کە لە پەیمانگای یەکگرتووی خزمەتگوزاریی پادشایی لە مانگی مایسی (١٨٧٣) دا پێشکەشی کردبوو. هەروەها بڕوانە :

Andrew, W. P., Euphrates Valley Route to India, in connection with the Central Asian and Egyptian Questions; Lecture delivered at the National Club on the 16th June, 1882 (London, 1882), 57 – 59.

بەبۆچوونی (کومننفێلد) ئەمانە گرنگترین هێڵەکان بوون، بۆ رووسیا، کە بتوانێت لێیانەوە بچێتە کەنداوی فارسی و پێیوابووە ئەو دووانەیان کە بە میسۆپۆتامیادا تێپەڕ دەبن گرنگیی تایبەتیان هەبوو. ئەمانە هەر ئەوە نەبوون بگەنە دەریاکانی باشوور، بەڵکو بناغەیەکی باشیشیان پێ دادەنرا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو تەواوی ئەو هەرێمەدا، کە دەکەوتە نێوانی دەریای سپیی ناوەڕاست، قەزوین و زەریای هیندییەوە.

ئەم خاڵە لە کرۆکدا گرنگییە ستراتیجییەکەی میسۆپۆتامیا بوو بۆ بریتانیای مەزن. زاڵبوون بەسەر ئەم هەرێمەدا ئارەزوویەکی گەورەی بریتانیابوو، بەلام ئامادەیی بریتانیا لەوێدا، بۆ شکست پێهێنانی گریمانی هەر پالنەر و هەڕەشەیەکی رووسی بەرەو ئەو ناوچەیە پێویستییەکی راستەقینەبوو بۆ خۆیان . چونکە ئەگەر بوار بدەن روسیا شوێن پێیەك بۆ خۆی لەکەناری دوو رووبارەکەوە پەیدابکات، ئەوا ئەولەویاتەکانیان لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانی، بەرژەوەندییەکانیان لە کەنداوی فارسی و لەسەرووی هەمووشیانەوە بوونی خۆیان لەناو ئیمپراتۆریا هیندییەکەیاندا بەشێوەیەکی ترسناك دەکەونە بەر مەترسی. ئەم بیروبۆچوونە لە دەورویەری ساڵی (١٨٣٠)یەوە لەلای بریتانییەکان گەلاڵە بوبو، لە سێ دەیەی پاشتردا گەشەی کردبوو، بەماوەیەکی کەمی پاش شەڕێ قرمیشەوە، لە ساڵی (١٨٦٠) دا بە توندی گەلاڵە بوبو.

لەو دەمەدا ئیتر شتەکان بەبیردا هاتنەوە و سەرلەنوێ بەخێرایی داوای پرۆژەی هێڵەئاسنینەکەی فوراتیش کرایەوە و سەرکەوتووانە روپێوکردن و ئاشکراکردنە خەرجیخۆرەکان بە درێژایی فورات و دیجلە دەستی پێکردەوە، "کۆمپانیای دەریاوانیی هەڵمیی فورات و دیجلە"سەرەتای کەوتنەوە چالاکیی خۆیی دەست پێکردەوە. لەمیانەی ئەم چالاکییانەوە میسۆپۆتامیا بە کردەوە گەڕایەوە ناو کایەی کاریگەریی بریتانییەکان و وەك نەریتی باویش زەمینەکانی ئەم کایەی کاریگەرییە بریتی بوون لە : بەرژەوەندی، ئیمتیاز، پێشەنگی، و هەموویشی لەلایەن دەسەلاتێکەوە ئاسانکاریی بۆ دەکرا، کە پێیدەگووترا: فەرمانڕەوایی پاشەڵ.[٢٤٢]

---

[242] سەرچاوەیەکی باشی تاوتوێکردنی "کایەی کاریگەری" بریتییە لە :
Fredrick L. Schumann's, in the Encyclopedia of the Social Sciences, XIV, 297 – 299.

Persian Gulf (Handbook, London, 1920) Official

Prentout, H, L'Ile de France sous Decaen (Paris, 1901)

Puryear, V. J., International economics and diplomacy in the Near East; a study of British commercial Policy in the Levant, 1834-1853 (London, 1935)

Rawlinson, H. C., England and Russia in the East (London, 1875)

De Rialle, Girard, An attempted French embassy to Persia under the auspices of Cardinal Richelieu, including an unpublished instructions by Louis XIII for a French embassy to Persia , Asiatic Quarterly Review, 2 ser., vols. 1-2 (January, 1891)

Roberts, P. E., History of British India (Oxford, 1938)

Schuyler, Eugene, Peter the Great, 2 vols. (New York, 1884)

Shupp, F. P., The European Powers and the Near Eastern Question, 1806- 1807 (New York, 1931)

Strandes, Justus, Die Portugiesenzeit von Deutsch- und English-Ostafrika (Berlin, 1899)

Susa, Nasim, The Capitulatory regime of Turkey; its history, origin, and nature (Baltimore, 1933)

Sykes, Percy, A History of Persia, 2 vols. (2nd ed., London, 1921)

Vambery, Arminius, The Coming Struggle for India (London, 1885)

Watson, R. A., A History of Persia, from the Beginning of the Nineteenth Century to the Year 1858 (London, 1866)

Wilson, A. T. The Persian Gulf (Oxford, 1928)

Foster, William, England's Quest of Eastern Trade (London, 1933)

Fournier, A. , Napoleon I (London, 1914)

Fraser, David, The Short Cut Route to India, the record of a Journey along the Route of the Baghdad Railway (London, 1909)

Fraser, Lovat, Some Problems of the Persian Gulf (London, Central Asian Society, 1908)

Hall, W. H., Reconstruction in Turkey (New York, 1918)

Hoskins, H. L., British Routes top India (Philadelphia, 1928)

Huart, Clement, Historie de Baghdad dans les temps moderns (Paris, 1901).

Hutton, James, The Shirley brothers, The Asiatic Quarterly Review, IV (1887)

Jorge, Nicolae, Geschichte der Europaischen Staaten, IV; Geschichte des Osmanischen reiches, 1774-19171 (Gotha, 1911).

Keller, A. G., Colonization (Boston, 1908).

Longrigg, S. H., Four Centuries of Modern Iraq (London, 1925)

Low, C. R., History of the Indian Navy, 2 vols. (London, 1877)

Mesopotamia, (Handbook No. 63, London, 1920- Official)

Miles, S. B., The Countries and Tribes of the Persian Gulf, 2 vols. (London, 1919)

Miller, William, The Ottoman Empire and its Successors, 1801-1922 (London, 1936)

Moberly, F. J., (comp.), The Campaign in Mesopotamia, 1914-1918, 4 vols. (London1923 - 1927) Official.

Mowat, R. B. The Diplomacy of Napoleon (London, 1924)

Pelissie, du Rausas, G. , Le Regime des capitulations dans 1' Empire Ottoman, 2 vols. (Paris, 1902-1905)

2. Secondary Sources

Andrew, W. P., India and her Neighbors (London, 1878).

----------, Euphrates Route to India, in connection with the central Asian and Egyptian Questions (London, 1882).

Auzout, A., La France et Muscate aux XVIII eme et XIX eme Siecles; Revue d' Historie Diplomatique, XXIII (Paris, 1909).

Birdwood, G. C. M., Report on miscellaneous old records at the India office (London, 1891)

Boulger, D. C. , England and Russia in Central Asia, 2vols. (London, 1879)

Bruce, John, Annals of the Honorable East India company, 3 vols. (London, 1810)

Colquhoun, Archibald R., Russia against India: The Struggle for Asia (New York and London, 1900)

Coquelle, P., Napoleon and England, 1803 – 1813 (English Translation by Gordon Knox, London, 1904)

Coupland, R., East Africa and its Invaders: from the Earliest times to the death of Seyyid Said in 1856 (Oxford, 1938)

Curzon, G. N., Russia in Central Asia, in 1889, and the Anglo-Russian Question (London, 1889)

-----------, Persia and the Persian Question, 2 vols. (London, 1892)

Deutsch, H. C., the Genesis of Napoleonic Imperialism (Harvard University Press, Cambridge, 1938)

Dodwell, H. H. (ed.), The Cambridge History of the British Empire, vol. IV, British India 1479- 1858 (Cambridge, 1929).

Esptein, M., The Early History of the Levant Company (London, 1908)

Farley, J. Lewis, Turkey (London, 1866)

= = , 1871, VII, No. 386
= = , 1872, IX, No. 322
= = , 1872, XLV, No. c 534

b. Contemporary Memories, Narratives, etc.
Ainsworth, W. F. , A Personal Narrative of the Euphrates Expedition, 2 vols. (London, 1888)

(Anonymous) review of Lord Valentina's , G. V., Voyages and Travels, 1802-1806, 3 vols. (London, 1809), the Quarterly Review (1809), II

Chesney, F. R. , The Expedition for the survey of the Rivers Euphrates and Tigris, carried on by order of the British Government, in the years 1835, 1836, and 1837, 2vols. (London, 1850)

------------- , The Russo- Turkish Campaigns of 1828- 1829: With a view of the present state of affairs in the East (second ed. , London, 1854)

Hakluyt, Richard, The Principal Navigations, Voyages, Traffiques and Discoveries of the English Nation, 12 vols. (Glasgow, 1903 - 05)

Hedges, William, Diary, 1681- 1687 (Hakluyt Society ed., London, 1887)

Kaye, J. W., The Life and correspondence of Major- General Sir John Malcolm, 2 vols. (London, 1856)
Lardner, Dionysius, (ed.), The History of Maritime and India Discovery, 3 vols. (London, 1830-31)

New Letters of Napoleon I omitted from the edition Published under the auspices of Napoleon III- English translation by Lady Mary Lord (London, 1898)

Olivier, G. A., Travels in Ottoman Empire, Egypt and Persia, "Translation from the French" (London, 1801)

Pinkerton, John, General collection of the best and most interesting Voyages and travels in all parts of the world; many of which are now first translated into English, 17 vols. (London, 1808- 1814)

Purchas, Samuel, His Pilgrims, 4 vols. (London, 1625)

## Select Bibliography

1. Primary Sources

a, Documents

Aitchison, C. U. Collection of Treaties, Engagements and Sanads relating to India and Neighboring Countries, I-XI (Calcutta, 1898) , XII-XIII (Calcutta, 1909)

Authentic official documents relative to the negotiation with France (Chappell, London, 1803)

Bernhardt, Gaston de (ed.) , Handbook of treaties, etc. Relating to commerce and navigation, between Great British and Foreign powers, wholly or partially in force on July 1, 1907 (London, 1908) Official

British and Foreign State papers 1812-1828, I-XV
Great Britain, Parliamentary Papers, Miscellaneous (22nd December, 1806)

Hertslet, Edward, Treaties and tariffs regulating the trade between Great Britain and foreign Powers, containing most-favored-nation clauses applicable to Great Britain, in force on the 1st January, 1875: Turkey (London, 1875)

---------------, Treaties, etc. , concluded between Great Britain and Persia, and between Persia and other Powers, wholly or Partially in force on the 1st April, 1891 (London, 1891)

Hertselt, Lewis (comp.), Commercial treaties, I-XIII (London, 1827 - 1877)

Noradounghiam, Gabriel, Recueil d' actes internationaux de l' Empire Ottoman, 4 vols., (Paris, 1887-1903).

Owen, S. J. (ed.) , A Selection from Wellesley's Dispatches (Oxford, 1877)

Parliamentary Debate, 1808, X
= = , 1834, 3rd series, XXIV
= = , 1857, 3rd series, CXLVII
Parliamentary History, XXXVI
Parliamentary Papers, 1834, XIV, No.478
= = , 1837, XLIII, No. 540
= = , 1837 – 38, XLI, No. 356

## ژیاننامەی نووسەر

زەکی سالح لە رۆژی (٢٧/ئۆکتۆبەر–تشرینی دووەم/١٩٠٨) لە بەغدا، عیراق لەدایکبووە. لە قوتابخانە میللییەکانی ناو بەغدا خوێندوویەتی. لە سالّی (١٩٢٧) دا بڕوانامەی ئامادەیی لە دواناوەندیی مەرکەزیی بەغدا وەرگرتووە.

لە هەمان سالّدا چووەتە زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت و سوریا و لە سالّی (١٩٣١) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە. لەنێوانی سالاّنی (١٩٣١– ١٩٣٧) لە وەزارەتی پەروەردەی عیراق کاری مامۆستایی و بەڕێوەبەرێتیی قوتابخانە میللییەکانی کردووە. لە (١٩٣٧– ١٩٤١) وەك قوتابییەکی خاوەن بڕوانامەی بەکالۆریۆس پەیوەندیی کردووە بە بەشی مێژووی زانکۆی کۆلۆمبیاوە لە نیویۆرك. لە مانگی حوزەیرانی سالّی (١٩٣٩) دا بڕوانامەی ماجستێر و دوو سالّیش پاش ئەوە بڕوانامەی دکتۆرای بەستهێناوە.

**کامیل محەمەد قەرەداغی**

**هەینی ٢٠/٣/٢٠٠٩ ز**

٢٩ / ڕەشەمێ/ ٢٧٠٨ ك

سلێمانی

# لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

## بەرهەمی نووسین

١-فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، د. کەمال میراودەلی.

٢- فەرهەنگی زەویزانی، جەمال عەبدول.

**٣-حركات الخوارج في غربي إقليم الجبال وشهرزور والجزيرة الفراتية:عطا عبدالرحمن محي الدين.**

٤- سۆفیزم و کاریگەریی لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا: ١٨٨٠- ١٩٢٥، د. جەعفەر عەلی

٥-قضـــاء هەڵـەبجـە، دراسه في الجغرافيه الإقليميه: عطا محمد علاءالدين.

٦-ڕۆڵی هۆکـــارە سیاســـییەکان لە دابەشبوونی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانیدا: جاسم محەمەد محەمەد

٧-پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا، ١٩٩١-١٩٩٨: هێرش عەبدوڵڵا حەمەکەریم.

٨-ڕۆژنامەگەریی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپاو ئەمریکا، ١٩٤٩-١٩٩١ ، نەوزاد عەلی ئەحمەد.

٩-هوشیاری کۆمەڵایەتی، فواد تاهیر سادق

١٠-شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥ ، د. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی.

**١١-إقليم كوردستان العراق في دائرة السياسات النفطية العالمية، د. محمد رؤوف سعيد مهندس زمناكو سعيد**

١٢-بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا ٦٣- ٨٤٧ ز، رحیم ئەحمەد ئەمین

**١٣-تعريب قضاء خانقين من منظور جيوسياسي، صلاح الدين انور قيتولي**

١٤-کۆیە، کامەران طاهر سەعید

١٥-بوون لە شیعری مەحویدا، د.محەمەد ئەمین عەبدوڵڵا

١٦-شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا، حەمە نوری عمر کاکی

١٧- ئەرمەنۆساید، مامەند ڕۆژە

١٨-کولتوور و ناسۆنالیزم، د. ڕەفیق سابیر

١٩- بنیاتی کارنامەیی لە دەقی نوێی کوردیدا، د. عبدالقادر حمە امین محمد

٢٠-ڕستەی باسمەند لە زمانی کوردیدا، کاروان عومەر قادر

٢١- جیۆگرافیای باشووری کوردستان، د. عەبدوڵڵا غەفوور

٢٢-دابەشبوونی دانیشتوانی شاری هەولێر، فاتیمە قادر مستەف

٢٣- ئیدیۆم چەشن و پێکهاتنی لە زانی کوردیدا، شیلان عومەر حسەین

٢٤-شیعری ناوچەی موکریان، د. عوسمان دەشتی.

25/Report on the Sulaimani District of Kurdistan، E.B. Soane.

## بەرهەمی وەرگێڕان

١-کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، حوسێن یڵدرم، لە سوێدییەوە: کاوە ئەمین.

٢-جەنگی عێراق، کاپلان و کریستڵ، لە ئینگلیزییەوە: عەبدولکەریم عوزێری.

٣-یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، م. ئە. حەسرەتیان، لە روسییەوە: د. دلێر ئەحمەد

٤-سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ئی.بی. سۆن، لە ئینگلیزیەوە: مینە.

٥- شەرەفخانی بەدلیسی- سەردەم، ژیان، ئەمریی، یڤگێنیا ڤاسیلیێڤا، لە روسیەوە: د.ئارام عەلی

٦-ریشەی کاریگەرییەکانی بریتانیا لەمیسۆپۆتامیادا، زەکی سالح،وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کامل محمد قرداغی

- **گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە یەکی ساڵی ٢٠٠٨**
- **گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە دووی ساڵی ٢٠٠٩**